یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا
32

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم کانونی دووەمی ٢٠١١



## خۆشەویستی ڕاستەقینە

## داهێنانی ڕێکخراوەیی

## بە کێ دەڵێن ڕۆشنبیر؟

## گەندەڵی

## ئاو خواردنەوە لای ژاپۆنییەکان

## ژیان باخەو ئێمەش باخەوان

## چیرۆکی سەرکەوتنی گەنجێکی کورد لە کاری بازرگانیدا

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan


مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم -ژمارە 32 - کانونی دووەمی 2011





چاپخانەی سەردەم

نرخ 2500 دینار







بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣

کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ -٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٥٠١١٥٥٠٣٧ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢



ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

# با لە منداڵەکانمانەوە دەست پێ بکەین!

کورد زۆر جوانی گوتووە کە دەڵێت: بەردی زل نیشانەی نەپێکانە. نیشانەی نەپێکانی ئێمەش لە بوارەکانی گۆڕانو داهێنانو پێشکەوتندا، خەریکبوونمانە بە بەردە زلەکانەوەو فەرامۆشکردنی گرنگترین بوارە کە گرنگیدانە بە منداڵەکانمان، کە ئێمە بمانەوێت، یان نا، دوارۆژو ئایندەی ئەم وڵاتە بەندە بە دوارۆژی ئەوانەوەو ئێمە هەرچییەك بکەین، دەبێت لە کۆتاییدا هەموو شتێك بۆ ئەوان جێ بهێڵین.

خۆخەریککردنمان بە بەردە زەبەلاحەکانەوە، وێڕای ئەوەی زۆر ماندوومان دەکات، بڕستو وزەمان لێ دەبڕێتو ئامانجەکانیشمان ناهێنێتە دی!

خۆئەگەر هەموو ئەو شتانەی کە ساڵەهای ساڵە، ئاڕاستەی گەورەکانی دەکەین، ئاڕاستەی بچکۆلەکانمان بکردایە، ئەوا بەرهەمی زۆر بەرچاوی دەبوو!

ئێمە بەم کارەمان دەمانەوێت کەشتی لە وشکانیدا لێ بخوڕین! ڕێگای چارەسەرمان نەگرتۆتە بەرو دەمانەوێت بە زووترین کاتیش بگەینە چارەسەر!

وادەزانین بە دەنگە دەنگو ژاوە ژاوو ڕەخنەگرتن، تا سەر ئێسقان هەموو شتێك تەواو دەبێت!

لە کاتێکدا پێویستە پێش ئەوەی داوای گۆڕانو چاکخوازی لە کەس بکەین، خۆمان بگۆڕیینو چاوێك بە ئێستەماندا بخشێنین!

ئێمەو هەموو ئەو کەسانەی ڕەخنەیان لێ دەگرین، پەروەردەی یەك ژینگەو وڵاتو پەروەردەیەکینو زۆرجار تەنها ئاوازەکانمان جیاوازن!!

گواستنەوەی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو، بۆ کۆمەڵگەیەکی شارستانیو مۆدێرن! گۆڕینی تاکەکان لە ژیانی بێبەرنامەییو بێیاساییو هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتییەوە، بۆ کەسایەتییەکی خاوەنبەرنامەو ڕێکوپێكو بەرپرسیارو دۆستی یاسا.. پێویستی بە پەروەردەو ڕاهێنانو هەوڵدانی بەرفراوان هەیەو کاری شەوو ڕۆژێك نییە.

گۆڕینی سیستەمی ژیانو بیرکردنەوەو پەروەردەو خوێندن، زۆر لە گۆڕینی سیستەمی دەسەڵات گرنگترە.

خەریکبوونو سەرقاڵبوونمان بۆ گۆڕینی شتە گەورەکان، وای کرد کە چەندین نەوەی نێگەتیف بێنە گۆڕێو ئێمەش دەبێت لە بازنەیەکی بەتاڵدا بخولێینەوە.

لە کاتێکدا منداڵ، ئەو بوونەوەرە پاکەیە کە دەتوانین بە گرنگیپێدان، نموونەی کەسی پێشکەوتووخوازو مۆدێرنو بەسوودو خاوەنبەرنامەو پەیامیان لێ دروست بکەین، تازە کەسانێك هەن دەقیان گرتووەو زۆرگوتن لەگەڵیاندا، ئاسنی سارد کوتینە.

پێشکەوتووترین وڵاتی جیهانیش، سەرەتا بە پێشکەوتوویی لە دایك نەبووەو بگرە زۆریان زۆر لە ئێمەش دواکەوتووتربوون، بەڵام ئەوان بۆ گۆڕینی ژیانو گەیشتن بە کاروانی ژیارو شارستانییەت، سیستەمی ژیانیان گۆڕی، بەرنامەیان دانا، نەوەکانی خۆیان یەك لە دوای یەك لەسەر بنەماو بەهای بەرز پەروەردە کردو ئەوانیان کرد بە بەردی بناغەی ژیانی هاوچەرخ!!

نەوەی نوێیان فێر کرد، کە ڕێزی خۆیان بگرن، ڕێزی کاتەکانییان بگرن، تەنها بەرژەوەندی خۆیان لە یاد نەبێت، وڵاتی خۆیان خۆش بووێت، ئەمەش وا بە ئاسانی ڕووی نەدا!

دەکرێت دوابەدوای خوێندنەوەی ئەم کورتیلە وتارە، مێردمنداڵێکی چاوگەش بانگ بکەن، با بۆ یەکەمجاریش بێت!

بزانە چەندێك تامەزرۆی ئەوەیە بیدوێنیت، قسەت بۆ بکات، گوێی بۆ ڕادێرە، خۆشترین قسەت گوێ لێ دەبێت! پرسیاری جوان، جیهانێکی هێمنو پاك.

تەماشا بکە چەند بە سانایی تێ دەگەن، بیردەکەنەوە، چەند پێیان خۆشە ڕێنماییان بکەیت، ئەرکیان پێ ببەخشیت، هانیان بدەیت!!

لە دیدی ئەواندا دوارۆژێکی ڕوون دەبینرێت، بەڵام بە داخەوە ئێمە فەرامۆشمان کردوون.

بۆ پەروەردەرکرنی سەدان هەزار منداڵی باخچەی ساوایانو قۆناغەکانی خوێندن، پڕۆژەمان چی بووە؟!

چەندمان بۆ نووسیون؟

چەند بۆیان دواوین؟

چەندێك کاتمان پێ بەخشیون، تا گوزارش لە ناخی خۆیان بکەن؟!

چیمان کرد بۆ ڕێنماییکردنیان؟

بۆ سوودمەندبوون لە وزەو توانایان، چیمان کرد؟

چەند کۆنفرانسو چەند سیمینارو چەند سەنتەرو کۆڕو خولو بەرنامەی کارمان ئەنجام داوە؟

یان هەر خەریکی بەردە گەورەکانینو نەپێکانی خۆمان بۆ چەندین جار دەسەلمێنین!!

دەبا لەمەولا بەردە بچکۆلەکان هەڵبگرینو پێکانی سەرکەوتنو گەشەپێدانو خستنەبەری ڕێگای سروشتیی گۆڕانو داهێنان بسەلمێنین.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەوانەی شایەنی پەیکەرن، هیچ پێویستییەکیان پێی نییە!

جین فاولەر

پێشوازی گەرم باشترین خواردنە، کە پێشکەشی میوانەکەتی دەکەیت

پەندێکی ئەسکۆتلەندی

ئازادی وەردەگیرێت، نابەخشرێت

پەندێکی جیهانی

ئایا من دوژمنەکانم تێکناشکێنم، کاتێك دەیانکەم بە دۆستی خۆم

ئەبراهام لنکۆڵن

ئێمە بەردەوام ئەو کەسانەمان خۆش دەوێت کە پێمان سەرسامن، ئەو کەسانەمان خۆش ناوێت کە پێیان سەرسامین

لاروشفۆکۆ

نابێت بڕیار بەسەر مرۆڤێکدا بدرێت بە هۆی شتێکەوە کە نایزانێت، بەڵکو پێویستە بە هۆی شتێکەوە بێت کە دەیزانێت

ڤۆڤنارغ

## كارگێڕی به‌ چیرۆك

# ده‌مامكه‌كه‌ت دابگره‌!

لاوێك كه‌ فێـری ڕێزگرتنی خودی خۆی نه‌بووبوو، له‌ پله‌ی كارگوزاری به‌رز كرایـه‌وه‌ تا لـه‌ كۆتاییدا گه‌یشـته‌ پله‌ی به‌ڕێوه‌بـه‌ری جێبه‌جێكـردن، (المدیـر التنفیذی).

بـه‌ڵام نه‌یتوانـی قه‌ناعـه‌ت بـه‌ خۆی بكات كـه‌ بووه‌ته‌ خاوه‌نی ئۆفیس‌و ڕاژه‌ی نوێ‌و پله‌ی به‌ڕێوه‌به‌رێتی، چونكه‌ متمانه‌ی به‌ خۆی نه‌بوو كه‌ گه‌یشتووه‌ته‌ ئه‌و شوێنه‌.

ڕۆژێكیـان كه‌سـێك هاتبـووه‌ سـه‌ردانی، ئه‌ویش بـۆ ده‌ربڕینی ئه‌وه‌ی كه‌ كه‌سـێكی گرنگه‌و هه‌میشـه‌ سه‌رقاڵی وه‌ڵامدانـه‌وه‌ی ته‌له‌فۆنـه‌، ته‌له‌فۆنـی نۆرماڵه‌كه‌ی هه‌ڵگرتو وای ده‌رخسـت كه‌ له‌گه‌ڵ كه‌سێكدا قسه‌ ده‌كات‌و له‌و كاته‌شدا داوای له‌و كه‌سـه‌ كرد كه‌ له‌ ده‌رگا ده‌دات تا بێته‌ ژووره‌وه‌!

له‌و كاته‌دا كـه‌ میوانه‌كه‌ چاوه‌ڕێی ده‌كرد جه‌نابی به‌ڕێوه‌به‌ر په‌یوه‌ندییه‌كه‌ی ته‌واو بكات، به‌ڕێزیان ده‌یانگوت: «گرفت نییه‌. خۆم ده‌توانم كێشه‌كه‌ چاره‌سه‌ر بكه‌م، پـاش چه‌ند خوله‌كێـك په‌یوه‌ندییه‌كه‌ی ته‌واو بوو. پرسـیاری لـه‌ میوانه‌كه‌ كرد كـه‌ چی خزمه‌تێكی هه‌بـوو؟ ئه‌ویش له‌ وه‌ڵامدا گوتی: قوربان هاتووم ته‌له‌فۆنه‌كه‌ چاك بكه‌م، چونكه‌ كارناكات!

له‌م چیرۆكه‌وه‌ فێر ده‌بین:

١- دانانی كه‌سی نه‌شیاو له‌ شوێنی گرنگدا، مایـه‌ی ئاڵـۆزی‌و به‌دكارگێڕی‌و كێشه‌ی جۆراوجۆره‌.

٢- متمانه‌ به‌خۆبوون له‌ گرنگترین سیفه‌ته‌كانی به‌ڕێوه‌به‌ره‌.

٣- هـه‌ر كه‌سـێك به‌ شـێوه‌یه‌كی ناسروشتی بگاته‌ پله‌وپایه‌یه‌ك، ناتوانێت به‌ شێوه‌یه‌كی سروشتی مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵدا بكات.

٤- بـا لـه‌ كاروبـاری ڕۆژانه‌ماندا مرۆڤێكی سـاده‌و ئاسـایی بیـن‌و هه‌وڵ بده‌ین خۆمان چۆنین ئاوها هه‌ڵسوكه‌وت بكه‌ین.

٥- ده‌مامكه‌كان ناتوانن بۆ هه‌میشه‌ حه‌قیقه‌تی ئێمه‌ بشارنه‌وه‌و ڕۆژێك ده‌بێت به‌ ئاسانی به‌رامبه‌ر ڕاستییه‌كان بزانێت.

٦- با هه‌وڵ بده‌ین خاڵه‌ لاوازه‌كانی خۆمان بدۆزینه‌وه‌و چاره‌سـه‌ریان بكه‌ین نـه‌ك زیاتریـان بكه‌یـن‌و په‌ره‌یـان پێ بده‌ین.

٧- با ئاستی خۆمان به‌رز بكه‌ینه‌وه‌ به‌ره‌و لوتكه‌ به‌ هه‌وڵدان‌و تێكۆشان نه‌ك به‌ خۆفریودان‌و كاری نادروست!

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

بەشی پێنجەم

# سەرکردایەتی

### تیۆرەکانی سەرکردایەتی:

لێرەدا گرنگترین تیۆرەکانی سەرکردایەتیکردن بە پێی گەشەسەندنی مێژوویی‌و ڕێکخستنی، باسی لێوە دەکەین:

یەکەم/ تیۆری نیشانەکان (السمات):

ئەم تیۆرە لەسەر بنەمای تیۆری (پیاوی مەزن) سەرهەڵدەدات «بە پشتبەستن بەو بیرۆکەیەی کە هەندێك کەس هەر لە دایك دەبن تایبەتمەندی سەرکردەیان تێدایە، بە مانای ئەوەی گوایە سەرکردەکان لە دایك دەبن، دروست نابن، یاخود سەرکردایەتی بە میرات بەجێ دەمێنێتەوە، نەوەك بە هەوڵدان و خۆپێگەیاندن» ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناکرێت کەسێك ئەو نیشانانەی تێدا نەبێت ببێتە سەرکردە، بە بڕوای ئەم تیۆرە چەند نیشانەیەك هەیە کە وەك پێوەرن بۆ دیاریکردنی تایبەتمەندی کەسی سەرکردە، چونکە ئەم پێوەرو نیشانانە سەرکردەکان جیادەکاتەوە لە کەسانی تر، پێوەرەکانیش شەش جۆرن:

١- تایبەتمەندییە فسیۆلۆجییەکان (بەدەنییەکان):

ئەم تایبەتمەندییانە (تەمەن) دەگرێتەوە لەگەڵ درێژی باڵا، ئەم تایبەتمەندیانە کاریگەریان لەسەر کەسانی تر هەیە، بەڵام لە هەموو هەڵوێستو حاڵەتەکاندا بەو شێوەیە نییە.

٢- ڕابردووی کۆمەڵایەتی:

بۆ زانینی ڕابردووی کۆمەڵایەتی‌و چۆنییەتی کاریگەری لەسەر ڕەفتاری سەرکردە، ئەو کاریگەرییانە وەك فێربوونو باری کۆمەڵایەتی‌و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر کەسایەتی سەرکردە.

٣- زیرەکی:

بریتییە لە یەکلایکردنەوەی کێشەکان بە زیرەکی‌و وردی لە وەرگرتنی کێشەکان لەگەڵ کاریگەرییەکانی دەوروبەر، توانای بڕیاردانو وەرگرتنی زانیارییەکان لەگەڵ قسە کردنو وتاردان بەشێوەیەك کە کاریگەری هەیە لەسەر جەماوەر.

٤- کەسایەتی:

لێکۆڵینەوەکان ئاشکرایان کردووە کە کەسایەتی سەرکردە کاریگەری هەیە لەسەر توانای سەرکردە بۆ سەرکردایەتیکردن، سەرکردەی سەرکەوتوو بە چەند شتێك جیادەکرێتەوە، وەك: بە ئاگایی، بڕوا بە خۆبوون، کۆنترۆڵکردنی پێویستییە تایبەتییەکان.

٥- گرنگی‌و تایبەتمەندییەکانی:

گومانی تێدانییە کە ئەو بوارانەی سەرکردە گرنگی پێ دەدات، پەیوەندی بە کەسایەتی‌و تایبەتمەندی خۆی هەیە، وەك توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاتی‌و ئاڕاستەکردنی کەسی لەگەڵ ئاڕاستەکردنی ئەو کارانەی کە جێگەی گرنگی پێدانە لای خودی سەرکردە.

٦- تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکان:

سەرکردەی سەرکەوتوو بەوە جیا دەکرێتەوە، چالاك‌و هاوکارو بەشدارە لە چالاکییە جۆراوجۆرەکان، کەسێکی تێکەڵە لەگەڵ زۆرترین کەسی دەوروبەری، ئەو شتانەش گرنگی خۆی هەیە لە لایەن کەسانی پەیوەندار بە سەرکردەوە، چونکە کاریگەری تایبەتی هەیە لەسەر یەکگرتنی کۆمەڵو هاوکاری کردنەکانیان.

هەندێك لە لێکۆڵەرانی کارگێڕی‌و دەروونناسانو توێژەرەکان کە پێکهاتوون لە «دەیڤید (kitt daivis))، ستوجدیل (stowdi)، گوود (Good)، ویری تایجی(Tyagi)، نیشانەکانی سەرکردەی لێهاتوو و سەرکەوتوویان دابەش کردووە بۆ چەند کۆمەڵەو خاڵێك، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها بۆچوونەکانی هەر یەك لە زاناو پسپۆڕی زانستی کارگێری (ویری تایجی (Tyagi)و گوود (Good)) دەخەینەڕوو، بەمەش بواری زیاترمان لە بەردەم ڕۆشن دەبێت سەبارەت بە نیشانەکانی سەرکردایەتی:

أ- گوود (Good)/ پێی وایە چەند نیشانەیەك هەیە کە زۆر پێویستە لە کەسی سەرکردەدا هەبێت:

- پێویستە توانای بیرکردنەوەی سەرکردە زیاتر بێت، لە توانای بیرکردنەوەی کەسانی بەردەستی.
- دەبێت سەرکردە ئەزموونو شارەزایی فراوانی هەبێت لە بواری کارەکەیدا.
- دەبێت توانای دەربڕینی بیروباوەڕی خۆی هەبێتو بتوانێت وا لە خەڵك بکات بڕوای پێ بکەن.
- دەبێت لە ڕووی عەقڵو سۆزەوە پێگەیشتوو بێت.
- دەبێت پاڵنەری کەسی هەبێت پاڵی پێوەبنێت بۆ کارکردن.
- دەبێت زیرەکی کۆمەڵایەتی هەبێت لە کارکردن لەگەڵ بەردەستەکانیدا.

ب- ویری تایجی (Tyagi)یش زانای کارگێڕی هیندی نیشانەکانی سەرکردەی سەرکەوتوو بۆ سێ کۆمەڵە دابەش دەکات:

* نیشانەکانی کەسی:
- بڕوا بەخۆبوونو زانینی ئامانجەکان.
- گیانی هاوڕێیەتی لە کارکردن.
- زیرەکیو خێرایی کارکردن توانای لەشیو تەندروستی.
- بەڕەوشتیو دەستپاکیو ڕاستگۆیی.
- بڕیاردانی ڕاست لە کارەکان.

* نیشانە سیاسییەکان:
- بریتییە لە توانای خۆگونجاندنو وەڵامی تەواو بۆ ڕێگا سیاسییە گشتییەکان.

* نیشانە یاساییەکان:
- بریتییە لە توانای جێبەجێکردنی یاساکان بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لەگەڵ زانینی ڕێگاکانی پەیوەندی فەرمیو زیرەکی لە بەکارهێنانو توانای بڕیاردانی دروست.

ج- بەڵام هەندێکی تر لە شارەزایانی کارگێڕی چەند خاڵێکی تریان ئاماژە پێکردووە کە زۆر کورتو پوختن، لە نیشانەکانی سەرکردایەتیکردن بەم شێوەیە: هێمنو سیما ناسە.
- باوەڕو وورەی بەرزی هەیە.
- کەسێکی خاکییە (متواضع)و دڵی باشە.
- نوێخوازو خاوەن زانیارییەکی زۆرە.
- پێشهات ناسە.

هەڵسەنگاندنی تیۆری نیشانەکان:

لەو ڕوونکردنەوانەی پێشوو لە لێکۆڵینەوەکان بۆ تیۆری (نیشانەکان) هاتووە کە لەسەر بنەمای تیۆری (پیاوی مەزن)بوو، دەبێت لەسەر دوو بنەما ئەم تیۆرە هەڵبەسەنگێنین ئەویش بریتییە لە لایەنی باشو لایەنی خراپی ئەم تیۆرە:

١- لایەنە باشەکانی تیۆری نیشانەکان:
- تیۆری نیشانەکان کاردەکات بۆ ڕوونکردنەوەی پێداویستییەکانی سەرکردایەتیو ڕووناکی خستنە سەر نیشانەکانی پێویست بۆ سەرخستنی، ئەم تیۆرە چەند نیشانەیەکی داناوە کە شێوەیەکی گشتی هەیە، مەرج نییە ئەو کەسەی ئەو نیشانانەی تێدا بێت، ببێتە سەرکردە، چونکە ئەگەر نەبێتە سەرکردەش ئەوە پێگەیەکی بەرزی دەبێت لە کۆمەڵگادا، بە شێوەیەك لە ڕیزی پێشەوە دەبێت لە کاتی هەڵبژاردنی سەرکردەدا.
- لە کاتی تیشك خستنە سەر نیشانە جیاوازەکان بۆمان دەردەکەوێت ئەوان دابەش دەبن بۆ دوو جۆر، نیشانەی زیرەکی بە ڕەچەڵەك، نیشانەی زیرەکی وەرگرتوو، کە سەرکردە دەتوانێت وەریبگرێت پاش بوونی بە سەرکردە.

٢- لایەنە خراپەکانی تیۆری نیشانەکان:
- نیشانەی هاوبەش نییە لە نێوان سەرکردەکاندا.
- نیشانەیەك نییە کە سەرکردەو کەسانی تری کۆمەڵ لێك جیا بکەیتەوە.
- گرنگیدان بە نیشانەی کەسی سەرکردە، بە بێ گرنگیدان بە لایەنەکانی تری سەرکردایەتی، وەك (بەردەستەکان، هەڵوێست، سروشتی ڕێکخستن).
- ڕێکەوتنێك نییە لە نێوان لێکۆڵەرەکان بۆ دیاریکردنی نیشانەکانی سەرکردە، هەروەها ڕێکەوتن نییە بۆ گرنگی ڕێژەیی بۆ هەریەك لەو نیشانانە کە پێویستن بۆ ئەوەی ئەو نیشانانە بزانرێت کە سەرکردە دروست نابێت بە بێ ئەو نیشانانە.

دووەم/ تیۆری هەڵوێست:

بیرۆکەی ئەو تیۆرە پشت دەبەستێت بەو بنەمایەی کە تایبەمەندییەکانی سەرکردایەتیکردن نابەستێتەوە بە نیشانەو تایبەتمەندی کەسی بە شێوەیەکی گشتی، بەڵکو پشت بە نیشانەو تایبەتمەندی ڕێژەیی دەبەستێت کە پەیوەندیدارە بە هەڵوێستێکی دیاریکراوی سەرکردە. ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە پێداویستییەکانی سەرکردایەتیکردن دەگۆڕێت بە گوێرەی کۆمەڵگاکانو ڕێکخراوە کارگێڕییەکان لە ناو یەك کۆمەڵگاو ڕێکخراو. لێکۆڵینەوە کارگێڕییە تازەکان گرنگی زۆریان بە شێوەی هەڵوێستی، یان بارودۆخی داوە، ئەم شێوەیەش پشت دەبەستێت بە گریمانە کردنی حاڵەتەکانی سەرکردایەتی کردنی سەرکەوتوو کە لەو حاڵەتانەدا زۆر پێویستی بە سەرکردەو بەردەستەکانی هەیە لەگەڵ هەڵوێستی سەرکردایەتیو بارودۆخە دیاریکراوەکە.

ئەو هۆکارانەی کە کاریگەری هەیە لەسەر سەرکردایەتی هەڵوێستی، یان بارودۆخی، ئەمانەن:

* مێژووی ڕێکخراوەکە.
* تەمەنی سەرکردەو شارەزایی.
* ئەو کۆمەڵگایەی کە ڕێکخراوەکە کاری لێدەکات.
* بارودۆخی دەروونی کۆمەڵگا.
* جۆری ئەو کارانەی کە سەرکردە دەیکات.
* قەبارەی کۆمەڵگا.
* ڕۆشنبیری تاکەکان.

سەرکردە بە ڕێژەیەکی زۆر پشت دەبەستێت بەو شوێنەی کە کاری تێدا دەکات، لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییەی لێیەتی بۆ نموونە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی بازرگانی پێویستی بە نیشانەو زیرەکی جیاواز هەیە لە نوسینگەیەکی خزمەتگوزاری، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێك کاری سەرکردایەتی هەیە پێویستی بە تواناو زیرەکی گونجاو هەیە.

لە لایەکی ترەوە نیشانەی سەرکردایەتی جیاواز هەیە بە گوێرەی قۆناغەکانی دامەزراندنی دامەزراوەکان بە شێوەیەك کە زۆر لە ڕێکخراوە کارگێڕییەکان بە سێ قۆناغ تێدەپەڕێت، لە هەر یەکەیاندا نیشانەی کارگێڕی جیاوازی هەیە، (قۆناغی یەکەم) قۆناغی تەواو کارییەو گرنگی دەدات بە دانانی بنەماکان کە پەیوەندنی بە بەردەوامبوونی چالاکی ڕێکخراوەکە هەیە، (قۆناغی دووەم) قۆناغی جێگیربوونی ڕێکخراوە، کە گرنگی دەدرێت بە بەدیهێنانو جێگیربوونی ڕێکخراوەکەو بە دەستهێنانی ناوبانگو گەیشتن بە ئامانجەکان. (قۆناغی سێیەم) کە قۆناغی پێگەیشتنو بەرەودانە، گرنگی دەدرێت بە دابینکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەندامەکانی لەگەڵ گرنگیدان بە گۆڕانکاری بەردەوام.

گرنگترین تیۆری کە کاری کردووە بۆ دیاریکردنی بنەماکانی هەڵوێستی کارگێڕی بریتییە لە:

یەکەم/ بەشدارییەکانی (فرید فیدلەر) (إسهامات):

فیدلەر وا دەبینێت کە تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتی بەستراوەتەوە بە هەڵوێستو کارلێکردنی سەرکردایەتی کە دیاری دەکرێت بە بواری گونجانی جۆری سەرکردایەتی بەکارهاتوو لە هەڵوێستێکی دیاریکراو، بۆ پێویستییەکانی ئەو هەڵوێستە، هەروەها ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەست لە هەڵوێست ئەو بارودۆخەیە کە ڕووبەڕووی سەرکردە دەبێتەوە، چونکە تاکە کەسە کە بەرپرسە لە سەرکردایەتیکردن.

دووەم/ بەشدارییەکانی (ولیام ڕیدن) (إسهامات)

(ولیام ڕیدن) هەستا بە شیکردنەوەی هەڵوێستی کارگێڕی بە وردبینکردنێکی کارگێڕی لە جۆرەکانی سەرکردایەتی کاریگەر لە سەر کاریگەری کارگێڕی. گرنگترین بنەماکانی ڕەفتاری کارگێڕی لە لای (ولیام ڕیدن)، بریتییە لە گرنگیدان بە چوار جۆری جیاوازی سەرکردایەتیو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ فەرمانبەران:
- ئەو سەرکردەیەی کە زۆر گرنگی دەدات بە کار.
- ئەو سەرکردەیەی کە زۆر گرنگی بە پەیوەندی دەدات لەگەڵ کەسەکان.
- ئەو سەرکردەیەی کە زۆر گرنگی دەدات بە کارکردن لە ڕێگەی پەیوەندی لەگەڵ کەسەکان.
- ئەو سەرکردەی کە زۆر گرنگی نادات بە کارکردن لە ڕێگەی پەیوەندی لەگەڵ کەسەکان.

لەوانەیە یەك لەو چوار جۆرە کاریگەر بێت لە بارودۆخو هەڵوێستێکی دیاریکراو، بەڵام لەوانەیە کاریگەر نەبێت لە هەڵوێستێکی تر، واتە کە کاریگەر دەبێت لەو هەڵوێستەی کە گونجاوە لەگەڵی.

* هەڵسەنگاندنی تیۆری هەڵوێست:

ئەم تیۆرە بە شێوەیەکی ڕوون بەشداری کرد لە دیاریکردنی بنەماکانی سەرکردایەتیکردن لە ڕێگای گرنگیدان بە هەڵوێستو هەڵسەنگاندنی وەك هۆکارێکی گرنگ.

لایەنە خراپەکانی ئەم تیۆرە:
- ڕێکەوتنێك نییە لەسەر بنەماکانی هەڵوێست، کە ئایا ئەو هەڵوێستەی کە دیاری هەڵوێستێکی گونجاوە، یان نا.
- ڕێکەوتن نییە لەسەر جۆرەکانی ڕەفتاری سەرکردایەتی.

د.محەممەد فەتحی
پسپۆر لە گەشەپێدانی مرۆیی و
پێشخستنی داهێنەرانە

بەشی دووەم

# بەڕێوەبەرەکەت بناسە

و: گۆران جەمیل

بەڕێوەبەری بە زەبروزەنگ:

کەسایەتی ئاوهایە:

١- خاوەنی ئیرادەیەکی ئاسنینە.

٢- گوێ لە کەس ناگرێت.

٣- دەمارگیرە، دەست بە بیروبۆچونەکانییەوە دەگرێت.

٤- بۆچوونەکانی دەسەپێنێت بە شێوەیەکی توندو دەمارگیرانە.

٥- بایەخ بە یاساو بنچینەکان دەدات زیاتر لە هەرشتێکی تر.

٦- ترسی لە دەسەڵاتەکەی هەیە کاتێك کە بۆچوونەکەی دەگۆڕێت.

چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- هەوڵ بدە کە نەرمونیان بیت لە گفتوگۆکردنتدا بۆئەوەی وا لە سەرۆکەکەت بکەیت کە گوێت لێ بگرێت.

٢- سەرۆکەکەت بناسەو بزانە هەڵسوکەوتی چۆنە لە کاتی ڕاپەراندنی کارو فەرمانی کارکردندا، زیاتر جەخت لەسەر چی دەکاتەوە.

٣- ئەگەر داوای لێکردیت کە کارێك ڕابپەڕێنیتو ڕێگاکەشی بۆ دیاری کردیت، بۆت دەرکەوت کە ڕێگاکەی ئەو هەڵەی تێدایە، ئەوە بە ڕێزەوە لەگەڵیدا دابنیشەو بۆی ڕوون بکەرەوە کە ئەگەر بەو شێوەیە ئەنجامی بدەیت، ڕەنگە ئەنجامی باش نەبێت، پێی بڵێ کە چارەسەری کێشەکەت لە لایە، داوا بکە کە ڕێگات بدات بیخەیتە ڕوو، بۆی ڕوونبکەرەوە کە پێدەچێت قازانجی بۆ دامەزراوەکە هەبێت بەگشتی، وابکە کە هەست بکات تۆ ئارەزووییەکی زۆرت هەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەم چارەسەرانە.

٤- با زانیاریت لەبەردەست هەبێت بە ژمارە، نەخشە، بڕی تێچوو، قازانج، بەربەستەکان (کە ڕەنگە دروست بن) لە هەمووی گرنگتر ڕێگاچارە.

٥- ئەگەر پێشنیارەکانتی ڕەت کردەوە، بێ هیوا مەبە، بەڵکو شێوازی تر بەکاربهێنە، بۆی ڕوون بکەرەوە کە کێ لە پێشنیارەکانت قازانج دەکات.

٦- سەرەڕای توندوتیژی ڕەشبین مەبە لە بەڕێوەبەرەکەت، ئەو ژیربێژانە بیر دەکاتەوە، خەڵکانی بەهێزو ئارەزومەندو ورە بەرزی خۆش دەوێت، کە هەمیشە هەست بە ڕەشبینی نەکات.

بەڕێوەبەری دڵڕەق

کەسایەتی ئاوهایە:

١- تەماحی زۆرە.

٢- بە بەردەوامی کاردەکاتو داوا لە تۆش دەکات کە وەك ئەو وا بیت.

٣- کارت لەسەر کەڵەکە دەکات، دەیەوێت پێشکەوتنێکی نا ژیربێژانە بە دەست بهێنیت بە یەکجار.

٤- هەمیشە دەیەوێت کە کاتژمێری

کارکردنت زیاد بکەیت.

٥- بەردەوامە لە سەر ماندوو کردنت، ئەرکت پێدەسپێرێت بە شێوەیەك کە لە توانات بەدەرە.

٦- ڕەچاوی باروودۆخت، یان پەیوەندییە تایبەتییەکانت ناکات، یان هەر شتێکی تر کە تایبەتن بە خۆتەوە.

٧ - ئەگەر باسی وادەیەکی تایبەت بە خۆت بکەیت، کە پەیوەندی بە کارەکەتەوە نییە لێت توڕە دەبێت، دەبێت هەمیشە یەکەمێتی بۆ ئەم کارە بێت کە مووچەی لەسەر وەردەگریت، ئەو هیچ هەستێکی نییە، جگە لەو هەستانە نەبێت کە دەیەوێت کاری پێ ڕاپەڕێنێت.

### چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- هەوڵ بدە شێوە هەڵسوکەوکردنێکت هەبێت کە وا بکات لە بەڕێوەبەرەکەت کە دادگەر بێت لەگەڵتداو پاداشتت بداتەوە لەسەر ئەوەی کە هەوڵدانێکی نائاساییت داوە بۆ بە دەستهێنانی ئەنجامێکی زۆرباش، لە ماوەیەکی کورتدا.

٢- بپرسە کە ئایا دەکرێت کار، یان پیشە دابەش بکرێت لەگەڵ هاوپیشەکانی ترتدا، یان تەنها یەکێك لەوان پێی هەڵبستێت.

٣- گفتوگۆی لەگەڵدا بکە کە بۆچی کارێکی زۆر بەسەر تۆدا دەدات؟ ئایا لە بەرئەوەیە کە تۆ بێدەنگیت، یاخود لەبەرئەوەی کە تۆ بە باشی کار ڕادەپەڕێنیت؟

٤- ئەگەر وتی: تۆ بە باشی کار ڕادەپەڕێنیت، بیری خەرەوە، ئەم هەموو کارە زۆرە بۆ تۆ بە تەنها، کاتێك زۆر ترت پێویستە، هەروەها کاتت پێویستە بۆ پشوودانیش بە مەبەستی گەڕانەوەی چالاکیت، یان پێویستت بە کەسانێکە کە یارمەتیو هاوکاریت بکات لە کارەکەدا.

٦- لەسەرخۆبەو با ڕۆحی هاوکاریت هەبێت، بەشێوەیەك بە کە توانای ڕاپەڕاندنی کارێکی زۆرت هەبێت، بەڵام دەبێت ئەویش بە بەزەیی بێت لەگەڵت، فشار نەخاتە سەرژیانی تایبەتیت.

### بەڕێوەبەری دادگەری ستەمکار

**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- خۆی بە دادوەر دەزانێت بە سەر خەڵکییەوە.

٢- سەرزەنشت دەکات بە بێ ئەوەی ڕاستییەکی لەلا بێت.

٣- بە دوای ئەو کەسەدا دەگەڕێت کە هەڵەی ئەنجامداوە بۆ ئەوەی بیکات بە قۆچی قوربانی، ئەگەر ئەو کەسە بەرگری لە خۆی نەکرد، ئەوا تۆمەت بارە، پێویستە لە کارەکەی دووری خەنەوە.

٤- هەرگیز دان بە شکستی خۆیدا نانێت بە ڕەهایی، هونەری ڕاکردن بە کاردەهێنێت کاتێك کە کەوتە تەنگانەوە، وەك دزێکی لێزان، ئەویش لە ڕێگای سەرقاڵکردنی خەڵکەوە بە یاساوە، هەمیشە قوربانی هەیە بۆ هەموو هەڵەیەك.

٥- هەمیشە بە دوای قوربانییەکانیدا دەگەڕێت، لەوانەی کە بەرهەڵستیو بەرگری ناکەن.

٦- پێی باشە دەست بگرێت بە کۆنترۆڵکردنو دانیشتن لەسەر بڵندگۆی دادوەری.

### چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- هەوڵ بدە نەبیت بە قۆچی قوربانی لەبەر دەستی دادوەریی ستەمکاردا، بەڵکو ببە بە شایەتحاڵێکی ڕاستگۆ کە قازانجت لێ بکات.

٢- کاتێك کە قسەت لەگەڵ دەکات هەوڵ بدە لە سەرخۆ بیت بە تەواوەتی، هەرگیز نەکەیت هەڵبچیت، چونکە لە مەسەلەیەکی تردا دیسان دەچیتەوە بەر دەستی بۆ دادگا، چونکە ئەمە سوکایەتی کردنە بە دەستەی دادوەریی، (واتە بەڕێوەبەرەکەت)، ئەمە دەبێتە پێشینەیەکی خراپو دەچێتە نێو دۆسییەکەتەوە. بە ئەدەبەوە پیشانی بدە کە تۆ ساویلکەو لاواز نیت، گۆشتی تۆ تاڵ نییەو نەخورێت.

٤- پێویستە شێوازی پرسیارکردن بەکار بهێنیت.

٥- لە ڕوانگەی بۆچوونەکانی خۆتەوە بەرگری، یان چاوپۆشی لە شتەکان مەکە.

٦- هەرگیز سەرزەنشتی کەس مەکە، بەڵکو هاوکاربەو لە مەسەلەکان دەرمەچۆ.

٧- ئەگەر ویستی ڕاتبکێشێت بۆئەوەی کە ببیت بە شایەت بەسەر هاوپیشەکەتەوە، بەم کارەی ڕازی مەبە مادام کارێکی باش نییە، چونکە حوکمدانی ئەمڕۆ بۆ هاوپیشەکەت، حوکمدانی سبەی تۆی بەدواوەیە.

### بەڕێوەبەری پیلانگێڕ:

**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- گڵۆپی سەوزت بۆ هەڵدەکات بۆ ئەنجامدانی کارێك، بەڵام سەرزەنشتت دەکات ئەگەر ئەنجامەکانی بە پێچەوانەی داواکراوەوە بێت.

٢- پشت بە توانای خەڵکانی تر دەبەستێت.

٣- بە دوای هەڵێکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی کە سەرکەوتنەکانی بخاتە پێش چاوی کەسانی لە خۆی بەرزتر، ئەمەش لەسەر حیسابی بەکارهێنانی سەرکەوتنی کارمەندانی ژێر دەسەڵاتی.

٤- ڕایدەگەیەنێت کە ئەو بەرپرس نییە لە هەڵەو کەموکورییەکان.

٥- هیچ بەڵگەیەك، یان جێ پەنجەیەك بە جێ نایەڵێت، وەك ئاماژەیەك بێت بۆ ئەوەی کە هەڵە لە تەرەفی ئەمەوە بێت.

٦- کارمەندانی ژێر دەسەڵاتی بە جێدەهێڵێت بە بێ ئەوەی کە هیچ یارمەتیان بدات، بەڵام ئەگەر شکستیان هێنا، ئەوا دۆزەخیان بۆ دەسازێنێت.

٧- تەنها کورسییەکەی خۆی دەپارێزێت.

### چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- وا هەست مەکە کە تۆ هەڵخەڵەتێنراویتو پێویستە کە زامنی ئەوە بکەیت کە یارمەتیت بدات.

٢- وا مەکە کە هەست بە دڵەڕاوکێ بکات سەبارەت بە تۆ، هەوڵ بدات کە خۆی لە تۆ بپارێزێت.

٣- پێویستە لەسەرت کە پرسیار بکەیت بۆ ئەوەی کە هەڵوێستی ڕاستەقینەی تۆی بۆ دەرکەوێت.

٤- ئەوە بخەرە پێشی کە هەڵوێستی لە بەرامبەرت بە هێز بێت.

٥- دژی مەوەستەوە، بەڵکو بەشێوەیەك قسەی لەگەڵدا بکە کە وا هەست بکات کە پیاوێکی دادگەرە.

٦- یارمەتی بدە بەوەی کە ڕێزە گەورەکانی بە دەست بهێنێت، ئەمەش لە ڕێگای ئەوەی کە پێشنیاری بەهێزی بۆ بکەیت کە دەبێتە هۆی هەڵوێستی بە هێزی ئەو.

٧- یارمەتی بدە بۆ ئەوەی کە بگات بەوەی کە ئارەزووی دەکاتو خۆزگە دەخوازێت کە خەڵکی بەو شێوەیە لێی بڕوانن.

٨- ئەو قازانجانەی بۆ دیاری بکە کە ڕەنگە ئەو بۆ خۆی بەدەستی بهێنێتو پاشان دامەزراوەکە، ئەگەر ئەو هەنگاوانە هەڵگرێت کە تۆ پێشنیارت بۆ کردووە.

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

# بەڕێوەبردنی داواکاری

## بەشی سێیەمو کۆتایی

٦- داواکاری تەواو: کاتێك کە ڕێژەی گشتی بەرهەمهێنانو خستنەڕوو یەکسان دەبێت بە داواکارییەکان پێــی دەوترێت داواکاری تەواو، لەو بارەدا بەڕێوەبەری دۆزینەوەی بازاڕ هەوڵ دەدات داواکارییەکان بپارێزێتو بە بەکارهێنانی شێوازی بازاڕی پارێزراو، بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکات، تاکو لە داهاتوودا بە زیادکردنی بەرهەم داواکاریو چالاکی لە سەر ئەو بەرهەمە زیاتر بکات، بەڵام ئەو ڕامیارییە لە ماوەیەکی درێژ کاریگەری نییە، چونکە ڕکابەرە زیرەکەکان بە بەکارهێنانی شــێوازێکی نوێ دۆزینەوەی بازاڕ لە هەموو ناوچەکانی دونیا هەڕەشــە بۆ ئەم بازارە دەکەنو هەوڵ دەدەن ئەو هاوکێشــەیە تێکبدەن.

لە هەندێ بازاڕدا داواکاری تەواو لە گروپی پیشەســازییەکان ئەنجام دەدرێت، پیشەسازی بریتییــە لە کۆمەڵــە ڕکابەرێك کە لە بازاڕی ئامانجدا هەیە. زۆرجار بە تایبەت لە وڵاتانی جیهانی ســێیەم کــە بازاڕ لە ژێــر کاریگەری چەنــد ڕکابەرێکدایەو بە هەماهەنگی، شــێوە جیاوازەکان، دابەشــکردنی بــازاڕو بڕیاردانی گشــتی لــە تــەواوی کارەکان هــەوڵ دەدەن کۆنترۆڵی بازاڕ بکەن، هەرچەندە ئەم کارە لە وڵاتانی پێشکەوتوو بە جۆرە تاوانێك لە قەڵەم دەدرێتو هۆکارەکەشــی بۆ ئــەوە دەگەڕێتەوە کە ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی نایاسایی هەوڵ دەدەن دژ بە بەکارهێنەرەکان بڕیار بدەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان دەبێت ڕکابەری یەکتر بکەن تاکو ڕێکخراوی شــیاوو بە توانا دەربکەوێتو پەیوەنــدی لەگەڵ کڕیارەکان دروســت بکاتو هەوڵ بــدات کڕیار بۆ خۆی ڕابکێشــێت، لەو بارەدا دەوڵەت دەبێــت چاودێری بازاڕ بکاتو بە شێوەیەکی یاسایی مامەڵە لەگەڵ تاوانباران بکات.

٧- داواکاری زیــادە: هەرچەنــدە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم جۆرە داواکارییانە پێشــنیار دەکرێت کە ڕیکلامــەکان ڕابگیرێت، تاکــو لە کاتی گونجاو بــە زیادکردنی قەبارەی بەرهەمهێنــان ڕێکخــراو بتوانێــت وەڵامــی داواکارییەکانی تریش بداتەوە، بەڵام بیرۆکەی جیهانــیو فراوانکردنــی پەیوەندییــەکانو خێرایی گواســتنەوەی زانیارییــەکان دەرفەتی ئــەوەی نــادات کــە داواکاری لــە ڕادەبەدەرو زیادە لــە بازارە ڕێکخــراوەکانو ڕکابەرییەکان ڕووبــداتو لە کاتی ڕوودانی ئــەم دیاردەیەش تەمەنــی زۆر کورت دەبێت بە پێی بنەمایەکی ئابــووری، ســەرمایە هــەر وەك ئــاوی ڕووبار دەمێنێتــەوە کە ڕاوەســتانی نییــە کاتێك کە لەســەر زەوی دەجوڵێت، یەکەمجار بەربەستو شــوێنە قوڵەکان پڕ دەکاتەوە، ســەرمایەش لە کاتــی جوڵانەوە لــە بازاڕ بەرەو ئــەو بازاڕانە ڕادەکێشــرێت کە زیاتر لە پێــش چاوە، بەڵام جیاوازییــەك لێرە هەیــەو ئەویش ئەوەیە کە ســەرمایەی زیرەك ناچێتە هەر بازاڕێك نابێت ئەگەر هــەر وڵاتێك دەیەوێت کە ســەرمایەی دەرەکــی بێنێتە نــاو وڵاتی خــۆی یەکەمجار دەبێــت ئەندامی ڕێکخــراوی بازرگانی جیهانی بێتو پاشــان هەوڵ بدات ڕێســاو ڕێنماییەکان چاکسازی بکات بە شێوەیەك کە ڕێژەی متمانەو پاراستنی سەرمایە بەرز بکاتەوە لەو حاڵەتەدا دەبێت کە ڕێکخراوەکانی دەرەکی بۆ بەدەســت هێنانی ئەم بازاڕانە ڕکابەری یەکتر دەکەن.

٨- داواکاری ناپاك: هەندێ لە بەرهەمەکان لەگــەڵ ڕێســاو ئادابــی وڵاتێــك نەگونجــاو دەبێــت هەرچەنــدە لەوانەیە ئــەو بەرهەمە لە هەندێ وڵاتی تر ئاســایی ســەرف بکرێت، لەو حاڵەتانە کاربەدەســتانو پیاوانی ڕامیاری کە بە شێوەی ســەرەکی دەوڵەتو گروپەکانی کەرتــی تایبەتن (NGO) هەوڵ دەدەن ڕێژەی ئــاگاداری خەڵك بــەرز بکەنــەوەو لە هەمان کاتــدا ناوبانگی ئەو بەرهەمــە کەم بکەنەوە. دەبێت دان بەوەدابنێن کە ئەم جوڵانەوەش بە بەشــێك لە زانستی دۆزینەوەی بازاڕ لە قەڵەم دەدرێت، چونکە پیاوانی دەســەڵاتدار بە هۆی ناسینەوەو هەڵســەنگاندنی سروشتی بەرهەم هاتنی ئەم شتومەکانە، کڕیارەکان، دابینکارانو خۆناســاندنیان بە خەڵكو دیاریکردنی کەمو کورتییەکانــی بەرهەمەکان هەوڵ دەدەن ڕێگە چارەیەك بۆ ئەم گرفتە بدۆزنەوە، هەرچەندە کە دەبێــت ڕەچاوی ئەو خاڵــەش بکرێت کە تەنیــا ئەم هەڵسوکەوتانە چارەســەر نییەو دەبێت ســوود لە پسپۆڕانی بازاڕو دۆزینەوەی بــازاڕ وەربگیرێــت بــۆ ئــەوەی بتوانرێت لە بەرامبــەر ئەم جــۆرە بازاڕانە ڕێو شــوێنی پێویست بگرێتەبەر.

لە کۆتاییدا:

داواکاری هەمان خواســتو پێداویســتییە کاتێــك کە بە هۆی توانــای کڕینی کڕیارەکان پشتیوانی بکرێت. ڕێکخراوەکان دەبێت بتوانن بــە هــۆی بەکارهێنانــی شــێوە جیاوازەکانی دۆزینــەوەی بازاڕ لــە بەڕێوەبردنی داواکاری، یــان هەمان بەڕێوەبردنــی دۆزینەوەی بازاڕو بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکان کۆششی پێویست ئەنجــام بــدەن. جۆرەکانی داواکاری بەســەر هەشــت گروپدا دابەش دەکرێــن، هەرچەندە هەریــەك لەو داواکارییانــە دەکرێت لە کاتو زەمەنێکــی دیاریکــراودا ڕووبداتو هەمیشــە جێگیــر نەبێت، بــەڵام ئەرکــی بەڕێوەبەری دۆزینەوەی بازاڕ ئەوەیە کە بە هۆی بڕیاردانی دروســتو بەدەســتهێنانی زانیاری لــە بازاڕو بەرهەمو ڕکابــەرەکانو جێبەجێکردنی وردی بڕیارەکان بە شــێوەیەکی کاریگەر سەرکەوتن لەو بوارە بە دەست بهێنێت.

ســەرچاوە/ بــە ســوود وەرگرتــن لــە ئینتەرنێت.

# داهێنانی ڕێکخراوەیی

ئا: وەهاب حەسیب محەممەد

بەشی دووەمو کۆتایی

داهێنانی ڕێکخراوەیی بە یەکێك لە کارە گرنگەکانی هەموو ڕێکخراوێك دێتە ئەژمار کە ڕووبەڕووی ژینگەیەکی ڕکابەرو گۆڕاو دەبێتەوە، لێرەوە هاندانو پێداگرتن لەسەر داهێنان دەبێت بە پێشەنگی ئامانجەکان کە زۆرێك لە ڕێکخراوەکان لە هەوڵی بەدەستهێنانیدان.

گرنگی داهێنان زیاتر دەردەکەوێت لە سێبەری کێبەرکێی نێوان ڕێکخراوەکان بە تایبەت ڕکابەری دەوڵەتی کە خوازیارە ڕێکخراو زیاتر داهێنەر بێت لە بواری کارکرندا، بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە هەر مەترسییەكو کەوتنە پاشو لە ناوچوونێك. لێرەوە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوانی هێنانە بوونی ڕێکخراوەیی‌و گۆڕانکاری ڕێکخراوەیی بە شێوەیەك گۆڕان بریتییە لە جێگیرکردنی چەمکێك، یان ڕەوشتێکی تازە سەبارەت بە ڕێکخراوەکەوە، هەرچی داهێنانە بریتییە لە چەسپاندنی ئەو بیرۆکە، یاخود ئاکارە لە بەشێکی کاردا، یان بازاڕێکی ڕێکخراوەکەدا، یاخود ژینگەیەکی گشتیدا.

چ کاتێك ڕێکخراوەکان پێویستیان بە داهێنانە؟ ئەو گۆڕانکاریانەی لە ژینگەی ڕکابەرییدا ڕێکخراوەکان تووشی دەبنەوە، پێداویستی ڕێکخراوەکان بۆ هێنانەبوون زیاتر دەکات، بۆ هێنانە بوونی ئەم پێداویستییە ڕێکخراوەکان کۆمەڵێك ڕێوشوێن دەگرنەبەر، لەوانە: دروستکردنی یەکەی بەڕێوەبردن، وەك فەرمانگەی لێکۆڵینەوەو تۆێژینەوە، یان یەکەی پێشخستنی ڕێکخراوەیی، کە ئامانجی چاودێری داهێنانو گەشەکردنە لە ڕێکخراوەکەداو ئاڕاستەکردنی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان، زۆرێك لە ڕێکخراوەکان کارمەندەکانیان لەسەر کاریی داهێنەرانە ڕادەهێنن. ڕێکخراوەکان کاتێك خوازیاری داهێنانن کە جیاوازییەك هەبێت لە نێوانی بەجێهێنانی ڕێکخراوەکە بە شێوەیەکی کرداری‌و نواندنی خوازراودا. ئەو پێداویستییانەی کە داهێنان بەسەر ڕێکخراوەکەدا دەچەسپێنێت گۆڕانکارییە لە ژینگەی ڕێکخراوەکەدا، وەك گۆڕانی تەکنەلۆجیاو گۆڕان لە ئارەزووی بە کارهێنەراندا [کۆمپانیاکان ساڵانە بەرهەمەکانیان دەگۆڕن لە ڕوویی چۆنییەتی‌و شێوازەوە، یاخود هەمان بەرهەم بە شێوەی جیاواز پیشانی کڕیار دەدرێت]، یان بوونی زانیاری لەسەر شێوازی باشتر کارکردن.

سەرچاوەکانی داهێنان:

١- سەرکەوتن‌و شکستی چاوەڕوان نەکراو، [ماوەیەکی زۆر وڵاتی سویسرا لە دروستکردنی کاتژمێردا پێشەنگ بوو، بەڵام کاتێك یابانییەکان بە کاتژمێری دیجیتاڵ هاتنە مەیدان، پێش کۆمپانیا سویسرییەکان کەوتن]، ڕووداوی دەرەکی چاوەڕوان نەکراو.

٢- نەگونجانی زەمینەی کرداری

لەگەڵ ئەوەی بە گریمانە دادەنرێت.

٣- گۆڕان لە هۆکارەکانی دیمۆگرافی وەك زۆربوونی دانیشتووان، کە بە دوایدا خواست لەسەر شمەكو خزمەتگوزارییەکان زیاد دەکات.

٤- گۆڕان لە بناغەی بەشەکانی کارکردندا، یاخود لە بناغەی بازاڕدا.

٥- گۆڕان لە هەستی چێژی بە کاربەراندا وەك وازهێنان لە جۆرێکی خواردنو گرنگیدان بە ژەمێکی تر.

٦- بوونی زانیاری تازە سەبارەت بە شمەكو خزمەتگوزاری.

بوارەکانی داهێنان:

دەستکەوتەکانی داهێنان لە بوارە سەرەکییەکانیدا بریتین لە:

١- کاراکردنی پلانی تازە، واتە گۆڕانکاری لە ئاراستەکردندا، وەك دەرکردنی فەرمان بۆ دیاریکردنی نرخی نوێ بۆ شمەکێك، یان خزمەتگوزارییەك.

٢- دۆزینەوەی چانسێکی نوێ، وەك پەرەپێدانی بەرهەمێکی تازە، یان دۆزینەوەی بازاڕێکی نوێ.

٣- بەکارهێنانی شێوازی تازە، وەك بنیاتنانی کارێکی نوێ، دۆزینەوەی ڕێگای نوێ بە مەبەستی تەواوکردنی کار، یاخود بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا.

٤- نەخشەکێشانی پەیکەرێکی نوێی ڕێکخستن، واتە بڕیاری گۆڕانکاری لە پەیکەری ڕێکخستندا، بنیاتنانەوەی ڕێکخستن، یان بنیاتنانی پەیکەرێکی نوێ، یاخود دروستکردنی پەیوەندی تازە لە نێوانی یەکەکانی کارکردندا.

ئاستەکانی داهێنان: پێویستە جیاکاری بکرێت لە نێوانی ئاستەکانی داهێناندا کە بریتین لە سێ ئاست:

١- داهێنان لە ئاستی تاکەکەسدا: بریتییە لە جۆرێك داهێنان تاکێك لە ڕێکخراوەکەدا پەی پێ دەبات، لە نیشانە دیارەکانی ئەو کەسە: ئارەزوویی دەرکەوتن، بەردەوامی، توانایی شیکردنەوە، باوەڕ بە خۆبوون، زیرەکی... هتد.

٢- داهێنان لە ئاستی کۆمەڵدا: بریتییە لەو جۆرە لە داهێنان کە کۆمەڵێك پەی پێ دەبەن، داهێنانی کۆمەڵ بەرینترە لە هێنانە بوون لە ئاستی تاکەکەسدا، توێژینەوەکان گەیشتونەتە کۆمەڵێك ڕاستی سەبارەت بە داهێنان لە ئاستی کۆمەڵدا لەوانە:

- گروپێکی تازە دروست بوو زیاتر ئارەزووی هێنانە بوونن، تا گروپێکی کۆن.

- ئەو گروپەی لە ڕەگەزی جیاواز پێکهاتووە توانستی شیکاری زیاترە تا گروپێك پێکهاتەکەی یەك ڕەگەز بێت.

- ئەو گروپەی یەکگرتوون، زیاتر ئامادەباشو کاران بۆ خەرجکردنی وزە، تا گروپێکی دوور لە یەك... هتد.

داهێنان لە ئاستی ڕێکخراوەکەدا:

بریتییە لە جۆرێکی نقار کە بە هۆی توانایی بە کۆمەڵی ئەندامانی ڕێکخراوەکەوە دێتە بوون، توێژینەوەکان تایبەتمەندییەکانی ڕێکخراوی داهێنەریان بەم شێوەیە دەستنیشان کردووە:

- بە ئاگابوون لە پێداویستیو ئارەزووەکانی بە کاربەران.

- ساناییو نەبوونی ئاڵۆزی لە پەیکەری ڕێکخستندا لە لایەن ئاستو یەکە کارگێڕییەکانەوە.

پەیوەست بوون بە لێهاتوویی سەرەکی ڕێکخراوەکەوە ئاوڕنەدانەوە بۆ ئەو بوارانەی کە ڕێکخراوەکە لێهاتوو نییە تیایاندا.

بەرهەمهێنان لە ڕێگەی بەشداریکردنی کارکەرانەوە لە ڕێکخراوەکەدا بە پێشکەشکردنی پێشنیارو لە جیاتی دانان.

بنەماکانی داهێنان: (پێتەر دراکر) هەستاوە بە دانانی کۆمەڵێك بناغە بۆ داهێنانی ڕێکخراوەیی بریتییە لە کارو مەشقکردن، پێویستە لەسەر ئەو ڕێکخراوانەی لە کاردان داهێنەربن، دەبێت پیادەی بکەن، هاوکات کۆمەڵێك مەشقەوەری دیاریکردووە پێویستە ڕێکخراو لێیان دوورکەوێتەوە لەوانە:

١- داهێنانی بە ئامانجو ڕێکخراو بە شیکردنەوەی فرسەتەکان [چانسەکان] دەست پێ دەکات.

٢- نابێت تەنها بیرلە ئاریشەکە بکرێتەوە، هەروەها دیدەنیو گفتوگۆی خەڵكو شیکردنەوە پێویستن، چونکە داهێنان دوولایەنی هەیە: لایەنێکی تێگەیشتنو لایەنی هەستکردن.

٣-بۆئەوەی داهێنانەکە کاریگەربێت، پێویستە سادە بێتو ئاراستەی پێداویستییەکی دیاریکراو بکرێتەوە.

٤- نقاری کاریگەر بە گچکەیی دەست پێدەکات، بە شێوەیەك تێچوونی زۆری لە دراوو کەسەکان پێویست نییە.

ئەو کارانەی پێویستە ڕێکخراوەکە دووریان لێبگرێت لە کاتی هێنانە بووندا بریتین لە:

١- زیادەڕەوی لە بیرکردنەوەداو پیشاندانی زیرەکی بە شێوەیەك، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی نقار کە کەسانی ئاسایی نەتوانن مامەڵەیی لەگەڵدا بکەن.

٢. هەوڵدان بۆ داهێنان لە داهاتوودا نەك ئێستا.

٣. دیاریکردنی جۆرەکان [جۆری نقار]و هەوڵدان بۆ کارکردنی کۆمەڵێك شت لە یەك کاتدا.

# گەندەڵی
# Corruption

شاخەوان جەمال

گەندەڵی دیاردەیەکە تەنها لەم سەردەمەی ئێمەدا سەری هەڵنەداوە، بەڵکو هەر لەکۆنەوە ئەو دیاردە دزێوە هەبووە.. بەڵام لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی ترو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاواز بووە.

ئەو وشەیە هێندە دزێوە، تەنانەت گەندەڵەکانیش خۆیان ڕقیان لێی دەبێتەوە. ئەگەر کەسێك بە گەندەڵترین کەس بڵێت: تۆ گەندەڵیت.. ئەوا زۆر بە توندی پێیدا هەڵدەشاخێت. هەر کات ئەو گەندەڵانە کاریان بکەوێتە مەترسییەوە.. ئەوا بەرامبەرەکەیان بە گەندەڵ ناودەبەن.. بۆئەوەی لەبەرچاوی خەڵکیدا ناشیرینی بکەن، دەتوانین نموونەی فیرعەون بهێنینەوە کە لەوپەڕی گەندەڵیدا بوو بە هەموو جۆرەکانییەوە.. کاتێك ڕووبەڕووی بانگەوازی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەبێتەوەو موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) داوای لێ دەکات کە واز لە گەندەڵی بهێنێتو چاکساز بێت. لە وەڵامدا فیرعەون پێی دەڵێت (إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ) غافر ٢٦.

فیرعەون لەوپەڕی گەندەڵیدا بە خەڵکەکە دەڵێت: من دەترسم موسا گەندەڵی لەسەر زەویدا بڵاوبکاتەوە.

## ئایا گەندەڵی چییە؟

وشەی گەندەڵی دژی وشەی چاکسازییە، دەتوانین بڵێین گەندەڵی بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی شتێك بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی. یاخود بریتییە لە خواردنی ماڵو سامانو شتی خەڵك بە ناڕەوا، یان پابەندنەبوون بە یاساوەو نەبوونی ڕوونیو شەفافیەت.

## بۆچی گەندەڵی ڕوودەدات؟

گەندەڵی کاتێك ڕوودەدات کە هیچ ڕێگایەکی یاسایی نامێنێتەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك، یاخود ناتوانرێت بە ڕێگایەکی یاسایی شتی مەبەستدار بەدەست بهێنرێت. لەم بارەدا بۆ بەدەستهێنانی شتی مەبەستدار پەنادەبرێتە بەر ڕێگای نایاسایی. بەوەش دەوترێت: گەندەڵی. بۆ نموونە لە کاتی دامەزراندندا ناسراوێتیو خزمایەتیو برادەرایەتی، دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێکی نەشیاو لە شوێنێکی شیاودا دابمەزرێت، یان لە کاتی وەرگرتنو دەرچوونی تەندەرەکاندا دەبینین لە ژێرەوە چەندین فێڵو تەڵەکە هەیەو ڕوویداوە کە سەرچاوەکەیان گەندەڵییە.. چونکە لە تەندەنەرەکاندا، ئیلتیزامو شەفافیەت زۆر کەمە.. هەروەك کوتلەر دەڵێت: تەندەرەکان ئیلتیزامیان تێدا نییە. ئەمەش واتە تەندەرەکان دەرگایەکی گەورەن بۆ گەندەڵی.

## ئایا گەندەڵی چ کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر کۆمەڵگە؟

بە دڵنیاییەوە گەندەڵی چەندین دەرەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە.. هەموو سەرچاوەیەکی سروشتیی وڵات، ماڵو دارایی، کاتو تواناکانی گەلو وڵات لە ناو دەباتو بێ هێزیان دەکات.. ناشهێڵێت کارەکان بە باشترین شێواز بەڕێوە بچن. بەمەش وڵات لە پێشکەوتنی تەکنەلۆجی، کارگێڕی، ئابووری، ڕۆشنبیریو ڕامیاری دوادەکەوێتو دەبێت بە نێچیری خەڵکانی تر.

بڕی ئەو پارەیەی کە ساڵانە بەڕێگەی نایاساییو گەندەڵی، لە جیهاندا خەرج دەکرێت، زیاتر لە یەك تریلیۆنو نیو دۆلارە.. زۆربەشی لە وڵاتە دواکەوتووەکانو هەژارەکاندایە، کە ئەم پارەیەش لە ڕێگەی ڕێکخراوە گەندەڵەکانو بەرپرسە گەندەڵەکانی ئەو وڵاتانەوە بە فیڕۆ دەدرێت.

هەندێك وڵات هێندە ڕێژەی گەندەڵی تێیدا بڵاو بووەتەوە.. پێویست ناکات ئاماژەی بۆ بکرێت. باسی ئەوە ناکەم کە لە یەکێك لە فەرمانگەکانی کوردستاندا چیم بەسەر هاتووەو داوای چییان لێکردووم.. بەڵام باسی ئەوە دەکەم کاتێك کە لە عێراقەوە بە ترانزێت بە وڵاتێکی عەرەبیدا تێپەڕیم بۆ وڵاتێکی تر، کاتێك لە فڕۆکەخانەی ئەو وڵاتە دابەزیم، ئەفسەرێکی ناو فڕۆکەخانەکە، کارەکانی زۆر گران کردین. هاوڕێکەم پێی گوتم: من چەندین جار لێرەوە تێپەڕیوم.. دەزانم بارودۆخ چۆنە.. هەندێك پارە بکە بە گیرفانیدا یەکسەر جەوازەکەت دەداتەوەو دەڵێت: جەوازەکەت تەواوەو کەلوپەلەکانیشت پێویست بە پشکنین ناکات.

# حوشترێکی شەل

محەممەد

حوشترێکی شەل بیستی کە حوشترەکانی ناوچەکە بە نیازن پێشبڕکێیەك ئەنجام بدەن، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا بەشداری پێشبڕکێکە بکات، سەرەڕای ئەوەش کە قاچێکی تەواو نییەو شەلە.

بۆ ڕۆژی دواتر داوایەکی پێشکەشی لیژنەی ناونووسین کرد تا ناوی تۆمار بکەن لە لیستی پێشبڕکێکاراندا، لیژنەی ناونووسین داوای ئەم حوشترە شەلەیان زۆر لا سەیرو نامۆ بوو!

حوشترەکەش پێی وتن: بۆچی سەرتان سوڕماوەو داواکەم بە نامۆ دەزانن؟ من خێرام لە ڕۆیشتنو جەستەشم بەهێزو پتەوە!

لیژنەکە ترسان لەوەی کە دووچاری زیانێك ببێت لە کاتی پێشبڕکێکەدا، بەڵام لەسەر داواو بەرپرسیاری خۆی ناویان نووسی.

ڕۆژی پێشبڕکێ هاتە پێش، حوشترەکان هەموو لە گۆڕەپانی پێشبڕکێ ئامادەبوون، کاتێك ئەم حوشترە شەلەیان بینی کە دەیەوێت بەشداری بکات لە پێشبڕکێکەدا زۆر گاڵتەیان پێکرد...

حوشترە شەلەکەش لە وەڵامیاندا وتی: لە کۆتایی پێشبڕکێکەدا دەبینین کە کێ بەهێزو خێرایەو دەتوانێت پێشبڕکێکە بباتەوە!

پێشبڕکێ دەستی پێکرد، حوشترەکان وەکوو تیر دەرچوون، حوشترە شەلەکەش لە دوای هەموویانەوە بوو!

بەڵام ورەی دانەبەزیو زۆر بە ئارامیو لەسەرخۆیی ڕێگەی دەبڕی، چونکە ئەگەر خێرا بڕۆیشتایە قاچەکانی تووشی ئازار دەهاتن..

حوشترەکانی دیکەش بە چیاکەدا هەڵگەڕان، چیاکە زۆر بەرز بوو، ڕێگایەکی هەورازو دووروودرێژ بوو..

حوشترە لاوەکان هەوڵیاندا بە خێرایی بە سەر چیاکەدا هەڵگەڕێن، بەڵام زۆر ماندووبوون.

هەندێکیان لە ئەنجامی ئەو ماندوێتییەیان کەوتنە خوارەوە، هەندێکی تریان نەیانتوانی چیدی بەردەوام بن لەسەر ڕۆیشتن، هەربۆیە بڕیاری گەڕانەوەیان داو پاشەکشەیان لە پێشبڕکێکە کرد.

حوشترە شەلەکەش بە هێواشیو بێ خۆ ماندوو کردنو بە متمانە بە خۆبوونەوە بەردەوام ڕێگەی دەبڕی!

زۆربەی حوشترەکان پێش ئەوەی بگەنە لوتکەی چیاکە پاشەکشەیان کرد، ئەو حوشترانەی کە توانیان بگەنە لوتکەی چیاکە ژمارەیان زۆر کەم بوو، ئەوانیش زۆر ماندووبوون، لەسەر لوتکەی چیا کەوتنە سەر گازی پشت، تا کەمێك پشوو بدەن..

حوشترە شەلەکەش کە بەوپەڕی بڕوا بە خۆبوونو ئارامییەوە ڕێگەی دەبڕی، تا گەیشتە لوتکەی چیاکە. چونکە لەسەرخۆو بەردەوام ڕۆیشتبوو هەستی بە ماندوویەتییەکی ئەوتۆ نەکرد، هەربۆیە بێ پشوودان بەرەو خوار بوویەوەو گەڕایەوە بۆ شوێنی دیاریکراو..

ئەو حوشترانەش کە لە پشوودابوون ئاگایان لە گەڕانەوەی حوشترە شەلەکە نەبوو تا گەیشتە خوارەوەی چیاکە..

ئیدی زۆر هەوڵیاندا تا پێی بگەنەوە، بەڵام نەیانتوانی...

بوو بە یەکەم حوشتر کە گەیشتە کۆتایی پێشبڕکێکە...

کاسەی پاڵەوانێتییەکەی بردەوەو زۆر شانازی بە خۆیەوە دەکرد...

منداڵانی ئازیز، دەزانن هۆکاری سەرکەوتنی حوشترە شەلەکە چی بوو؟

بێگومان هەموومان لە وەڵامدا دەڵێین: سێ خاڵی سەرەکی وای لە حوشترەکە کرد کە پێشبڕکێکە بباتەوەو سەرکەوتن بە دەست بهێنێت:

١- بڕوا بە خۆبوون.

٢- بەردەوام بوون.

٣- پەلە نەکردنو ئارامگرتن.

ئا: هەڵکورد مسعود

# چیرۆکی سەرکەوتنی گەنجێکی کورد لە کاری بازرگانیدا

## بە (٢٠٠٠) هەزار دۆلار دەستی بە کارکردووە، ئێستا خاوەنی چەندین کۆمپانیایە!

گەر خۆی نەناسێنێت سەرۆكو جێگرو کارمەندەکانی لێك جیاناکەیتەوە، نەك بە هۆی بێسەروبەریو پشێوی کۆمپانیاکەی، بەڵکو سادەییو خاکی سەرۆکی کۆمپانیای (پارسیانی مەرکەزی) ئەو بارودۆخەی دروستکردووە «کۆمپانیای پارسیانی مەرکەزی سەرەتا لە شاری تاران دامەزراوە، بەڵام ئێستا لقی هەیە لە هەر یەك لە وڵاتانی ئازەربەیجان، قیرغستان، تورکمانستان، ئەرمەنستان، تاجکستان، ئەڵمانیا، هەولێر» ئەمە قسەی ئەو گەنجە کوردە بزنسمانەیە بە ناوی (د. کامەران ڕەهبەری) کە بە تەنها خۆی خاوەنی کۆمپانیای پارسیانی مەرکەزییەو کوردێکی ڕۆژهەڵاتی ئێرانە، ئەگەرچی ئەو گەنجە لە دایكو باوکێکی دەوڵەمەند لە دایکبووە، بەڵام وەك خۆی باسی دەکرد ئەو هەمیشە ئامانجی ئەوە بووە کە خۆی، خۆی پێبگەیەنێت، بۆیە ئەو لەسەرەتای قسەکانیدا باسی ئەوەی کرد بۆ ئەوەی بتوانیت سەرکەوتوو بێت لە هەموو کارێك یەکەمین شت دەبێت ئەو کەسە ڕاستگۆ بێت، شارەزا بێت لە ئەتەکێتی کارەکەی بۆ ئەوەی بزانێت چی دەکاتو چۆن دەگات بە پلەی سەرکەوتن.

د. کامەران بێجگە لەوەی سەرمایەدارێکی گەورەیە لە هەمانکاتدا پەیوەندییەکی تایبەتی هەیە لەگەڵ وەرزشو خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە فیسیۆلۆژیو (١٧) ساڵ یاریزانی تۆپی دەستی هەڵبژاردەی ئێران بووە، بۆ ماوەی (١٠)ساڵ جێگرو بەڕێوەبەری یەکێتی تۆپی دەستی ئێران بووە، (٨)ساڵیش ئەندامی یەکێتی ئاسیا بووە، ئێستا سەرۆکی بەڕێوەبردنی پێشبڕکێی تۆپی دەستی جیهانەو پاڵێوراوە بۆ سەرۆکی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی ئاسیا، بەڵام وەکو خۆی گوتی «من کاری بازرگانی تەنها بۆ خۆشی خۆم دەیکەمو لە هەمانکاتدا توانیومە سەرکەوتوو بم لە کارەمدا، ئەگەرنا من ئەوەندەی سەرقاڵی وەرزشم ئەوەندە وەك پیشەیەك هەڵسوکەوت لەگەڵ بزنسمانی ناکەم» ئەو لەو ماوە کورتەی کە هاتووەتە کوردستان توانیویەتی کۆمەڵێك چالاکی ئەنجام بدات بە بێ بەرامبەر وەك ڕێزگرتن لە وەرزشەوانانو ناردنەدەرەوەی زیاتر لە (٥٠٠) کەس بۆ بێنینی خولی تایبەتو جۆراوجۆر، جیا لەوە ئەو بەوپەڕی شانازییەوە باسی ئەوەی دەکرد کە یەکێك لە نهێنییەکانی سەرکەوتنی ئەو لە کوردستان دروستکردنی پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەگەڵ هەموو کەسێکدا «من تا ئێستا سەردانی هەر شوێنێکم کردبێت زیاتر لە چەندین کەس بوونەتە هاوڕێم، چونکە ئەگەرچی من سەرۆکی کۆمپانیایەکی گەورەم، بەڵام کاتێك دەچمە یاریگاکان، یان شوێنێکی گشتی لە ناو جەماوەر دادەنیشمو قسە لەگەڵ یەکتر دەکەینو لە ڕێگای گۆڕینەوەی ژمارەی

تەلەفۆنو ئیمەیڵ هاوڕێیەتی یەکتر دەکەین، هەموو ئەو شتانەی کردوومە تەنها بۆ دڵخۆشی خۆمو کەسانی تر بووە نەك بە مەبەستی ڕیکلامکردن بێت بۆ کۆمپانیاکەم، بە هۆی دروستکردنی ئەو پەیوەندیانەم ئێستا دەتوانم لە دونیا هەر شتێکم بوێت بە یەك تەلەفۆن کارەکانم بۆ ئاسان دەکەن».

سەبارەت بەوەی چۆن دەتوانین کۆمپانیایەکی نموونەیی دروست بکەین، ئەو دەڵێت: «پێش هەموو شتێك دەبێت، بەڕێوەبەری کۆمپانیا هاوڕێ بێت لەگەڵ کارمەندەکانی، زۆر پەرۆشو دڵسۆزو شارەزا بێت بۆ کارەکەی، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر سەرۆكو بەڕێوەبەرێك دڵی بۆ دوو شت چوو بێگومان شکستو تیاچوون چاوەڕێی دەکات، یەك ئافرەت دوو خۆشەویستی زۆر بۆ کۆکردنەوەی پارە» کامەران ڕەهبەری چیرۆکی سەرکەوتنی دەگێڕێتەوە بۆ چەند ساڵێك پێش ئێستا، کاتێك دەستی بە کاری بازرگانی کردووە، سەرەتا تەنها (٢٠٠٠) هەزار دۆلار سەرمایەکەی بووە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك هاوکاری بکات، یاخود پیشتیوانی بێت، بەڵکو تەنها بە هەوڵو ورەبەرزی خۆیو زیرەکی لە کاری بزنسمانی ئەوی گەیاندووەتە ئەم ڕۆژە، هەروەها دەڵێت: «تا ئێستا هیچ کەسێك هاوکاری منی نەکردووە، ئەو کەسەی کە دەڵێت من چۆن دەتوانم ئەو کارانە بکەم ئەگەر لایەنێك لە پشتم نەبێت، ئەوا من پێی دەڵێم نە خەڵك پیاوی منە نە منیش پیاوی حکومەتو لایەنێکی دیاریکراوم، تەنها هۆکاری سەرکەوتنم دامەزراندنی ئەو کۆمپانیایەیە کە بە هەوڵو تێکۆشانی خۆم بووە، چونکە من دەزانم کارەکەی خۆم بە چ هونەرێك بەڕێوە دەبەم، «د. کامەران ڕەهبەری ئێستا زیاتر لە (٩٠٠) کارمەندی هەیە لەسەرجەم لقی کۆمپانیاکەی لە دونیادا، بەڵام ئەم سەرۆك کۆمپانیایە واتە دکتۆر ڕەهبەری پارەی خوێندنی زانکۆو فێربوونی زمانو تێچووی پرۆسەی هاوسەرگیری سەرجەم کارمەندەکانی لە ئەستۆی خۆی گرتووە، هەموو ئەو خزمەتگوزاریانەشی بۆ یارمەتیدانی ئەوانو سەرکەوتنو گەشەپێدانی کۆمپانیانیاکەیەتی کە وەك خۆی باسی کرد «لە کۆی ئەو فەرمانبەرانەی لای من کار دەکەن (٤٠٠) کەسیان خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرنو شارەزان لە کاری بازرگانی، واتە کاری ئێمە بە هەڕەمەکی بەڕێوە ناچێت، بەڵکو تەواو ستانداردو ئەکادیمییە، بۆیە دەکرێت بڵێین ئەمانە بەشێکن لە هۆکاری سەرکەوتنی من لە کاری بازرگانیدا».

گرنگترین پرۆژەکانی ئەو بازرگانە ئێستا لە کوردستان دروستکردنی زانکۆیەکی وەرزشییە، کۆمەڵگایەکی وەرزشی بە هەموو پێداویستییەکانی بە ناوی «وەرزش بۆ هەمووان»و دامەزراندنی ئاژانسێکی جیهانییە کە پێکهاتووە لە تەلەفزیۆنو ڕادیۆو ڕۆژنامە، جگە لەوە بەم نزیکانە بە نیازە گەورەترین پێشانگای وەرزشی بکاتەوە بە ئامادەبوونی چەند کەسایەتی وەرزشی جیهانی، د.کامەران ڕەهبەری زیاتر بازرگانی لە بواری وەرزشی دەکاتو بەشێك لەو کارانەشی بێ بەرامبەرە، بەڵام ئەو دەڵێت: «هەموو ئەو کارانەی دەیکەم بۆ ئەوە نییە سوپاس بکرێم، چونکە من جیا لەوەی کاری بازرگانی دەکەم لە هەمانکاتیشدا دەمەوێت خزمەتێك بە نەتەوەکەم بکەم، من هیچ جیاوازییەك ناکەم لە نێوان لایەنێكو شارێکدا، بۆیە لە حاڵی ئێستادا چاوەڕێی سوپاسی هیچ کەس ناکەم، بەڵکو ئەگەر من بەڕاستی کەسێکی باشو ڕاستگۆ بم، بێگومان کارەکانم وا لە بەرامبەرەکانم دەکات سوپاسم بکەن» بە قسەی د. ڕەهبەری سەرکەوتنی ئەو لە بواری بازرگانیو گەیشتنی بەو پلەیە هەر یەك لە ڕێزگرتنو هاوڕێیەتی کردنی هەموو کەسێك، شارەزاییو زیرەکی لە کارەکەی، کار پێکردنی کارمەندی بە تواناو لێهاتوو لە لای خۆی، گوێ نەدان بە ڕەخنەی خەڵكو بەردەوامبوون لە بازرگانی کردن لەسەر بنەمایەکی زانستی، هۆکاری سەرکەوتنی ڕەهبەرییە لە بواری بزنسمانی، لە دواین قسەکانیدا ئەو بازرگانە باسی لەوە دەکرد، کە کۆکردنەوەو بە دەستهێنانی پارەی زۆر هیچ کات بنەمایەکی سەرەکی نییە بۆ سەرکەوتن لە ژیان لای ئەو، هەر بۆیە ئەو بە پێکەنینەوە گوتی: «سەرکەوتن لای من لە ژیان دڵخۆش کردنی بەرامبەرەکەمو یارمەتیدانی هەموو مرۆڤێکە کە پێویستی بە یارمەتی هەیە».

# پەیوەندی لە ناو کۆمپانیادا

لە بنیاتنانی پەیوەندییەکی باشدا، کە سەرکەوتویی لە کارو پەیوەندی سەرکەوتووت لەگەڵ کارمەندەکانی ناو کۆمپانیاکەتدا بۆ دەردەخسێنێت، چۆن سەرکەوتوو دەبێت؟

لە هەر بەشێك لە بەشەکانی کۆمپانیادا، لەگەڵ دوو کەسدا پەیوەندی پێکبهێنە. با یەکەمیان ئەڵقەی سەرەکیی نێوان خۆتو ئەو بەشە بێتو لە کاتی داوای یارمەتیکردن، یاخود زانیاری، سەرەتا پەیوەندی بە ئەوەوە دەکەیت.

هەرچی کەسی دووەمیشە، ئەڵقەی دووەمی پەیوەندییە. واتە: ئەو کەسەیە کە لە کاتی نەبوونی کەسی یەکەمدا، پەیوەندی پێوە دەکەیت.. ئەمەش لەبەرئەوەی دڵنیا بیت لە کاتی پێویستبوونت بە یارمەتی.. دانامێنیتو کارت بەردەوام لە ڕاییبووندایە.

هەروەها ئەو بەشانەی لە ڕابردوودا پەیوەندیت پێیانەوە نەبووە، فەرامۆش مەکە.. چونکە ڕێی تێدەچێت، کاتێك بێتە پێش، پێویستیت بە پەیوەندی دروستکردن هەبێت لەگەڵیاندا.

# لێدوانەکانی کۆتلر لە بازاڕسازیدا

**ستراتیژییەتی بازاڕسازی قازانجدار چی پێکدەهێنێت؟**

ئاشکرایە کە یەك ڕێگا نییە کە پێشەوایەتی بکات بەرەو سامان، لە بری پشتبەستن بە جیاوازی، یا یەك هێزی پاڵنان. کۆمپانیا پێویستییەتی کە ڕایەخە تایبەتەکەی خۆی بچنێت لە چالاکیو تایبەتمەندییەکانی بازاڕسازی، ئەوەندەش بەس نییە کە زۆربەی کارەکان باشتر بن لە ڕکابەران، هەروەك پرۆفیسۆر مایکڵ پۆرتر لە زانکۆی هارفارد تاوتوێی ئەوە دەکات کە کۆمپانیا ستراتیژییەتی ڕاستی نییە ئەگەر هاتوو هەمان چالاکی ئەنجامدا، وەکو چالاکییەکانی ڕکابەرانی. بەڵام کەمێك بە ڕێگایەکی باشتر. کە لەوانەیە کاریگەر تر بێت نەوەکو تەنها لە لایەنی بەکارخستن، بە واتای ئەوەنا کە زۆر نایاب بێت لە لایەنی بەکارخستن وەکو ئەوەی کە ستراتیژیەتێکی بەهێزت هەبێت، چونکە ناسینەوەی بەکارخستن یارمەتی کۆمپانیا دەدات کە ماوەیەك قازانج بکات. بەڵام کۆمپانیای تر هەن کە پەیڕەوی دەکەن یا لێی تێدەپەڕن.

هەروەك پۆرتر کارەکان وادەبینێت کە ستراتیژییەتی بەهێزە ئەگەر هاتوو خاڵی جیاوازی هەبوو کە جیای دەکاتەوە لە ستراتیژییەکانی ڕکابەرانی. هەر بۆیە کۆمپانیای Dell بۆ کۆمپیوتەر هەڵسا بە دانانی ستراتیژیەتێك ئەویش بە هەڵبژاردنی فرۆشتنی ئامێری کۆمپیوتەر لە ڕێگای تەلەفۆن لە بری فرۆشتنی بە تاك، هەر بۆیە بازاڕسازی ڕاستەوخۆ گەشەی کردو بنکەی داتاکانی تێپەڕاندو توانی کە قەناعەت بە کڕیارانی بکات لە بەهاو خزمەتی پێشکەش کردووی، لە دواییدا ستراتیژیەتێکی تێپەڕاند بە خستنەڕووی، یا پشتبەستن بە ئینتەرنێت، وەکو کەناڵێکی فرۆشتن. لەمڕۆشدا Dell ڕۆژانە زیاتر لە بەهای سێ ملیۆن دۆلار لە ئامێری کۆمپیوتەر دەفرۆشێت لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە.

کۆمپانیای تر ستراتیژییەتی ناوازەی داهێنا، وەکو (أیکیا) بۆ کەلوپەل داهێنانی نوێی کرد بۆ دروستکردنو فرۆشتنی کەلو پەل کە لە بەراووردێکی تۆکمە دایە لەگەڵ فرۆشیارانی کەلوپەلی یەك ڕێچکەیی. لە هەمان کاتدا بەشی ساتیرن Saturn لە کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆڕزی ئۆتۆمبێل بە ڕێگایەکی جیاوازە بە تەواوی بە بەراورد بە کارگەکانی ئۆتۆمبیلی یەك ڕێچکەیی. کۆمپانیای بە کرێدانی ئۆتۆمبێل Rent – A – Car شوێنێکی ناوازەی بۆ خۆی هەڵکەند لە بازاڕی بە کرێدانی ئۆتۆمبێل ئەمەش لە بەکرێدانی ئۆتۆمبێلە کۆنەکان لە شوێنە هەرزان باوەکان لەگەڵ دەستخستنی گەڕاوەکانی لە کۆمپانیاکانی دڵنیایی.

بەڵام ئایا ئەم ستراتیژییەتە نوێیانە ناتوانرێت لاسایی بکرێتەوە بە خێراییەکی زۆر کە وای لێبکات ئاسایی بێت؟ بەڵێ، لاسایی کەرەوان بە ڕێگاوەن، هەر ئەمەش کۆمپانیای فڕۆکەوانی ساوپ ویستو کۆمپانیای أیکیا بۆ کەلو پەل فێری بوو، سەرباری ئەمانەش کەچی لاسایی کردنەوەی هەندێك ڕووخساری ستراتیژی نوێ شتێکە، بەڵام لاسایی کەرەوە بتوانێت کە هەموو لایەنەکانی ئەندازەی ستراتیژی کۆپی بکات شتێکی ترە، ستراتیژییە گەورەکان لە گروپو

کۆمەڵەی ناوازە پێکدێن لە چالاکی پاڵپشت کە ڕووبەڕووی هەر لاساییەك دەبێتەوە. لەسەر لاسایی کەرەوەش نییە کە بەرامبەر تێچوونێکی گەورە بێتەوە لە هەوڵی لاسایی کردنەوەی هەموو چالاکییەکانی کە لاسایی کردووەتەوە. لە باشترین باریشدا کۆتایی دێت بەوەی کە لاسایی کەرەوەیەکی خراپ دەردەچێتو قازانجێکی ماماوەندی بۆ دەستەبەردەکات.

ئەو هەڕەشانەی بازاڕسازی کە زۆرینەی کۆمپانیاکان ڕووبەڕووی دەبنەوە! لە ماوەی ئەو سیمینارانەی کە کردوومنەتەوە داوام لە زۆرێك لە بەڕێوەبەران کردووە کە بۆم باس بکەن چۆن کڕیارانی ئەمڕۆ دەبینن، ئەمەی خوارەوە وەڵامەکانیانە:

* کڕیارەکان زۆرتر هەستیار بوون بەرامبەر بە نرخ.
* ئەوان کاتی تەواویان نییەو دەیانەوێت زیاتر بحەسێنەوە لەگەڵ بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان.
* تێبینی جیاوازی زۆر دەکەن لە بەرهەم لە نێوان دابینکاران.
* کەمتر بایەخ دەدەن بە (مارکە)ی دروستکەر، زیاتر قبوڵی (مارکە)ی دووبارە فرۆشراو و بەرهەمە گشتییەکان دەکەن.
* پێشبینی بەرزیان هەیە لە بەرامبەر خزمەت.
* چوونەڕیزێکی هاودژییان هەیە لە بەرامبەر دابینکاران.

لە پاشاندا پرسیارم لێکردن سەبارەت بە کوالێتی کاری کەلوپەلەکانی بازاڕسازی، وەڵامیان دامەوە بە:

- بەرهەمەکانیان زۆر جیاوازی نییە لە بەرهەمی ڕکابەرانیان.
- ئەوان قوربانی زیاتر دەدەن بە خزمەتی تێچوونو سەربارەکانی تر تاوەکو بگەن بە فرۆشتن.
- نرخەکانیان هاوتای نرخی ڕکابەرانە.
- ڕیکلام کردن بە تێچووترەو کاریگەری کەمترە.
- زیاتر لە پێویست خەرج دەکەن بۆ بانگەشەی فرۆشتن.
- تێچوونی تیمی فرۆشتن لە بەرزبوونەوەی بەردەوامدایە.

شێوە (١ — ٢):

ئەو پرسیارانەی کە بازارگەران دەیکەن:

١- چۆن دەتوانین کە چینێکی گونجاوی بازاڕ دیاری بکەینو هەڵیبژێرین تا خزمەتی بکەین؟

٢- چۆن دەتوانین کە جیاوازی بکەین لە نێوان خستنە ڕووەکانو خستنە ڕووی ڕکابەران؟

٣- چۆن وەڵامی ئەو کڕیارانە بدەینەوە کە فشارمان دەخەنە سەر بۆ ئەوەی بە نرخی کەمتر پێیان بدەین؟

٤- چۆن بتوانین ڕکابەری ڕکابەران بکەین کە تێچوونی بەرهەمیان کەمترو نرخیان کەمتر لە ناوخۆیی، یا نێودەوڵەتییە؟

٥- تا چ ئاستێك دەڕۆین لە دیزاینکردنی خستنە ڕووەکانمان بە گوێرەی داواکاری کڕیار؟

٦- ڕێگا سەرەکییەکانی پەرەپێدانی کارمان چین؟

٧- چۆن بتوانین (مارکە)ی بەهێز دروست بکەین؟

٨- چۆن بتوانین تێچوونی داواکاری کڕینی کڕیار کەم بکەینەوە؟

٩- چۆن بتوانین لەسەر چوونە ڕیزی کڕیارەکان بۆ ماوەی درێژخایەن بمێنینەوە؟

١٠- چۆن بزانین کە کام کڕیار گرنگترە؟

١١- چۆن بتوانین کە داهاتی ڕیکلامەکانو بانگەشەی فرۆشتنو پەیوەندی گشتی پێوانە بکەین؟

١٢- چۆن دەتوانین کە بەرهەمی تیمی فرۆشتن زیاد بکەین؟

١٣- چۆن دەتوانین کە کەناڵی جۆراوجۆر بنیات بنێینو مامەڵە لەگەڵ جیاوازی کەناڵەکان بکەین؟

١٤- چۆن وا بکەین کە کارگێڕی کۆمپانیای تر مەیلی زیاتر بەرەو لای کڕیار بچێت؟

هەموو ئەمانە بە واتای ئەوەیە کە کۆمپانیا ڕووبەڕووی هەڕەشە دەبێتەوە بەرامبەر ئەو قورساییەی هەیەتی، کاتێك کە بیەوێت ئەدای خۆی پەرەپێبدات لە بازاڕ هەروەك داوام کرد لە بەڕێوەبەرانی بازاڕسازی کە لیستێکی سەرەکی بنووسن بەو پرسیارە سەرەکیانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە کاتی دانانی ستراتیژییەتو تەکنیکی نوێی بازاڕسازی، هەروەك شێوەی (١ -٢)ی سەرەوە کە چواردە پرسیاری سەرەکی تێدا بوو. هیوادارم هەموو ئەو پرسیارانە تاقی بکەمەوە لەم پەرتووکەدا.

بێگومان بابەتەکانی بازاڕسازیش جیاوازدەبێت لە نێوان کۆمپانیاکانو لە ڕووی گرنگی، هەر کەرتێکی کار ململانێ دەکات لەگەڵ هێزی جیاواز. هەروەك دوو کارگەی کاڵا کە خاوەن پەیوەندییەکی بازرگانیو بایەخ پێدانی تایبەت بە خۆیان هەیە:

- پەراوێزی قازانجە گەراوەکان.
- تێچوونی فرۆشتنو بانگەشەی بەرز.
- زیادبوونی هێزی فرۆشتنی تاكو گەڕانەوەی خێرایی فرۆشتن.
- ڕکابەری لە نیشانەی کۆگا بازرگانییەکانو بەرهەمە گشتییەکان.
- زیادبوونی هێرشی چینەکانی کڕیاری تاکڕەوی Niche.

هەروەك دابەشکارانی بە تاك لە کۆگاو شوێنە بازرگانییەکان خەمی خۆیان هەیە:

* پەراوێزی قازانجی گەڕاوە.
* دڕندەی کۆمەڵەکان Category Killers.
* ڕکابەری لە فرۆشتنی بە کەتەلۆكو داواکاری پۆستەو شێوەی تر لە شێوەکانی بازاڕکردن لە دەرەوەی سنووری شوێنو کۆگا بازرگانییەکان.

هەرچی سەبارەت بە کۆمپانیا پیشەسازییەکانە ئەوا جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیان هەیە لە ڕووی تایبەتمەندیو فاکتەری سەرکەوتنو ئەو ڕۆڵەی کە کارگێڕی بازاڕسازییەکان دەیگێڕێت. هەروەك پاشکۆی کۆتایی ئەم پەرتووکە ئەو جیاوازییانە ڕوون دەکاتەوە لە نێوان دە جۆری جیاواز لە کۆمپانیاکانی بازاڕسازیو لە کۆمپانیایەك بۆ یەکێکی تر.

# ئاسوودەیی بەرد... یا گەڵا؟

و: ئومێد عەلی

کوڕێکی گەنج لە لێواری ئاوێك دانیشتبوو، خەمبارو شڵەژاو، داڵغەی بۆ قوڵایی ئاوەکە ڕۆیشتبوو، شیوانا بەو شوێنەدا تێدەپەڕی، چاوی پێکەوتو سەرنجی دا کەسێکی خەمبارو شڵەژاو بوو، لە تەنیشتییەوە دانیشت، کوڕە گەنجەکە کاتێك شیوانای بینی لە خۆڕا گوتی: زۆر خەمبارو شڵەژاوەو ژیانم لێ تێکچووە، زۆر پێویستیم بە ئاسوودەیی هەیە، بەڵام نازانم ئەو ئاسوودەییە لە کوێ پەیدا بکەم؟!

شیواناش گەڵایەکی لەسەر زەوی هەڵگرتو خستیە ناو ئاوەکەو گوتی: سەیری ئەو گەڵایە بکە، کاتێك دەکەوێتە ناو ئاوەکە، خۆی دەداتە دەست ڕۆیشتنی ئاوو لەگەڵیدا دەڕوات.

پاشان شیوانا بەردێکی گەورەی لە ڕۆخی ئاوەکە هەڵگرتو خستیە ناو ئاوەکەوە، بەردەکە بە هۆی قورسی خۆی چووە ژێر ئاوەکەو لە قوڵایی ئاوەکەدا لە تەنیشت بەردەکانی تردا جێگیر بوو.

شیوانا گوتی: ئەو بەردەشت بینی، بە هۆی قورساییەکەیەوە توانی بەسەر هێزی ڕۆیشتنی ئاوەکەدا باڵا دەست بێتو لە قوڵایی ئاوەکەدا جێگیر بێت؟

ئێستا تۆ بە من بڵێ، ئایا ئاسوودەیی بەردەکەت دەوێت، یاخود ئاسوودەیی گەڵاکە؟!

کوڕە گەنجەکەش بە سەرسوڕمانەوە تەماشای شیوانای کردو گوتی: بەڵام گەڵاکە ئاسوودە نەبوو؟ ئەو لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکی ئاوەکەدا دەچووە سەرەوەو خوارەوە، ئێستاش دیار نییە، لە چ شوێنێکە! هەر نەبێت بەردەکە دەزانێت لە کوێ ڕاوەستاوە، سەرەڕای ئەوەی کە لە سەرەوەو دەوروبەریدا ڕۆیشتنی ئاو هەیە، بەڵام بە توندو تۆڵی ڕاوەستاوەو لە جێی خۆی ناجوڵێتەوە، من ئاسوودەیی بەردەکەم لە لا پەسەندترو باشترە.

شیوانا زەردەخەنەیەکی کردو گوتی: بۆچی لە دژوارییەکانو ناخۆشییەکانی ژیانت بەردەوام دەناڵێنیت؟ ئەگەر ئاسوودەیی بەردەکە هەڵبژێریت، دەبێت توانای خۆڕاگرتنی دژوارییەکانیشت هەبێتو بەهێزەوە لە هەر شوێنێك کە هەبێت ئاسوودەییو خۆڕاگرتنەکەت لە دەست نەدەیت.

شیوانا ئەوەی گوتو هەڵسا کە بڕوات، کوڕە گەنجەکە کە هەستی کرد کەمێك ئاسوودە بووە، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو هاوڕێیەتی شیوانای کردو ماوەیەك هاوڕێگابوو لەگەڵیدا، پێش چەند خولەکێك لە کاتی ماڵاواییکردن، کوڕە گەنجەکە لە شیوانای پرسی: ئەگەر ئێوە لە جێی من بوونایە، ئاسوودەیی بەردەکەتان هەڵدەبژارد، یا ئاسوودەیی گەڵاکە؟

شیوانا زەردەخەنەیەکی کردو گوتی: من تەواوی ژیانی خۆم بە دڵنیاییەوە بە دەست خولقێنەری ڕووباری بوون بە ڕۆیشتنی ژیان سپاردووە، چونکە دەزانم کە لە باوەشی ڕووبارێکدام کە هەموو گەردیلەکانی ئاماژە بە بوونی دروستکارەکەی دەکات، هەر بۆیە لە کەوتنو هەڵسانەوە هەرگیز شڵەژاو نابم، من ئاسوودەیی گەڵام لە لا پەسەندە، چونکە تەنیا یەك چرکەش دڵم نایەت کە هەلی هاودەمیو جوڵەی لەگەڵ ڕۆیشتنی ژیان لە دەست بدەم.

لە دڵی کەوتنو هەڵسانەوەی بزوێنەرەکانی ژیانە کە ئەو ئاسوودەییە قووڵو بێ وێنەیە بە دەست دێت.

بەڵام ئەوە تۆی کە لە کۆتاییدا ئاسوودەیی بەردەوامت لە کەوتنو هەڵسانەوە دەست دەکەوێت، بەڵام ئەگەر هاوکات ڕۆیشتنی گەڵا هەڵبژێریت، یاخود ئاسوودەییو قورسیو جێگیری بەردەکە! لە هەردوو حاڵەتدا تۆ لە ناو ئاوەکەدای!

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

# یاسایەكی ئەخلاقی گرەنتی مانەوەی دەسەڵاتتە بەزیندویەتی!!

گوڵان حەمە ئەمین

بەڵـێ ئێمـە هەمیشـە پێویسـتمان بە بیركردنـەوە لـە ڕابردوو هەیـە، هەروەك چـۆن بە بێ بیركردنەوە لە داهاتوو، نابینە خاوەنـی بەرهەمـی نوێ، بە لـە یادكردنی ڕابردووش هەرچیمان هەبێت وەك بنیاتنانی كۆشكێك وایە بە بێ بوونی بناغە.

تائێرە خوێنـەری ئازیز لە مەبەسـتی بابەتەكە نەگەیشتویتو نازانیت باسەكەمان باسـی چ لایەنێكـی مەعنەوییـە، لێـرەدا تەنهاباس لە لایەنێك لە لایەنە گرنگەكانی بە هەند وەرگرتنی ڕابردوو، لە پێش چاوبوونی داهاتـوو دەكەیـن لـە ڕووی مەعنەوییەوە، بـەڵام كاریگەریو گرنگییەكی هەیە كە هیچ كات مادده ناتوانێت لە ئاسـتیدا بووەستێت، بناغەیەكـی گرنگە لـە چەمكی «ئەخلاق» بە هـۆی لە یادكردنی ئـەم بناغە گرنگەی كایەی «ئەخـلاق»ە كەوای كردووە كارمەند بەڕێوەبـەری خۆشـنەوێت، منـداڵ دایكو باوكی خۆش نەوێت، خوێندكار مامۆسـتای خۆشـنەوێت، هـەژار دەوڵەمەندوخـاوەن سـامانی خۆشـنەوێت، هاوڵاتـی سـەرۆكو دەسەڵاتدارانیان خۆشنەوێت!

وادەزانم تائێستا دەڵێی بۆچی وایە؟

بەڵام لە ئێسـتا بـەدواوە هـاوڕا دەبن لەگەڵ بۆچوونەكەمدا، ئەو بەڕێوەبەرەی لە بیـری كردووە تادوێنێ بـوو خۆی كارمەند بوو، ئێسـتا وامامەڵە لە بەرامبەر كارمەندو ئەوانەی ژێردەسـەڵاتی خۆیـدا دەكات وەك ئـەوەی بـە بەڕێوەبەری هاتبێتـە دونیاوە، یاخـود ئـەو خاوەنكاروكۆمپانیایـەی كـە وادەزانێت كە گرەنتی تامردنی بۆ كراوە كە ئەم خاوەن سامانو دەسەڵات بێتو ئەوانەی ژێردەسـەڵاتی ئەویـش گرەنتـی تامردنیان بۆكـراوە كـە هەر لەسـەر ئـەو بارودۆخە بمێننـەوە، یاخـود ئـەو دایـكو باوكـەی پێیان وایـە خۆیان هەڵەیـان نەكردووە لە ڕابـردودا، كاتێـك هەڵەیەك بـەدی دەكەن لە منداڵەكانیانـدا، وەكو كوردەواری دەڵێت: منـداڵ دەكەن بـە كێوا! یاخـود ئەومنداڵە لـە بیری دەكات كـە تادوێنێ بوو لاواز بوو، گەر ئەوساتەی كە لەوپەڕی هێزوتوانادایەو هاواردەكات بەسـەر دایكو باوكیدا سـاتێك بیربكاتـەوە لەو ڕۆژگارەی كە كاتێك مەمكە شـیرەكە لە دەمی دەكەوتەخوارەوەو توانای نەبـوو بیخاتەوە نێودەمی! ئێسـتا بە خۆی نەدەنازی! یـا بیری لـەوە بكردایەتەوە كە سـبەینێ وەك منداڵـی لێدێتـەوە توانـای خزمەتكردنی خۆشی نابێت! ئەو مامۆستایەی لـە یادی خـۆی بردووەتەوە كـە ڕۆژگارێك بـوو دەسـتی قەڵەمی نەدەگرتو زۆرشـتی نەدەزانـی، بـەڵام ئێسـتا هەڵەو پرسـیاری خوێندكار دەیخاتە پێكەنین، ئەی ناگونجێت ئەو خوێندكارە لە داهاتودا ببێتە مامۆستای تۆ؟ ئەو سەرمایەدارەی پێكەنینی بە كزۆڵیو بە بەرگی شـڕی هەژارێك دێت، كێ گرەنتی پاراستنی سەروەتەكەی بۆ كردووە؟!

ئەو دەسەڵاتدارو سەرۆكەی نایەوێت بۆ ساتێكیش خەیاڵی فەنتازییانەی بپچڕێنێتو بیر لە نیگەرانی هاوڵاتیانی بكاتەوەو گوێ بۆ داواكانیان بگرێـت، هەر دوور نەڕۆین دیارە سەرۆكی پێشووی عێراقی لە یاد كردووە!!

ئەمانـە مشـتێك بوون لـە خەرمانێك، بەڕاسـتی هەمووان دەگرێتەوەو كەسـی لێ دەرناچێـت، چونكـە هەركەس دەسـەڵاتی بەسـەر چینێكـدا، یاخـود كەسـانێك، یـا كەسـێكدا هەیـە، زۆربەمـان، یاهەمووومان ڕۆژێـك هەسـتمان برینـدار كرابێـت بـە مامەڵەیەكی ناپەسـەندو نەشـیاوی كەسێك كە تەنها دەسـەڵاتی واژۆكردنی كاروبارێكی زۆرسـادەی هەبووە! كە وەڵامی سەلامیشـی نەداوەتـەوە!! ئـەم دیاردەی لـە خۆگۆڕانو خـۆ بە گەورە زانینە مرۆڤ بە ئەندازەیەك بچـووكو بێ نـرخ دەكات نـەك تەنها وەك سنوری دەسـەڵاتەكەی خۆی، بەڵكو لە پێش چاوی بەرامبـەردا كەمترین نـرخو بەهای نامێنێت!

ئـەم چیرۆكەم بیرهاتـەوە، دەگێڕنەوە ڕۆژێك پیاوێكی «حەماڵ» كە پەسـتەكێكی بارهەڵگرتنی لەسەرشـان بـوو، هێندە باری هەڵگرتبوو پشـتی چەمابـووەوە، لە ڕۆژێك لەڕۆژەكانـی بێـزاری لە كارەكـەی بلیتێكی «یانسیب»ی كڕی بەو نیازەی بەخت یاوەری بێـتو لەم هەژارییـە ڕزگاری ببێت، كاتێك ئەنجامی تیروپشك ڕاگەیەنرا ئەو ژمارەیەی كە پارەكەی بۆ دەرچوو ژمارەی پسـوڵەكەی ئەوبـوو، هەر بۆیـە زۆربە خۆشـحاڵییەوە ڕۆیشت پەستەكی حەماڵییەكەی داناو خستییە ناوئاوێكـەوە لە تۆڵەی ئەوەی كە هەمیشـە ماندووبـوو بە هـۆی ئەو كارە سـەختەوە، بەڕێكـەوت بەرەو وەرگرتنی پارەكەی، بەڵام بەداخـەوە بیری كردەوە كە پسـوڵەكەی لە نێو گیرفانی پەستەكەدابووە!!

تـۆی خوێنەر پێت وانییە زۆركەسـمان هەیە كە كەسـایەتییە ڕاستەقینەكەی خۆی فڕێداوەتە نێودەریای لە خۆبایی بوونییەوە؟ كاتێك دەزانێت كەزەبری نەما، كەس ئاوڕ لە قسەكانی ناداتەوەو نرخیشی نامێنێت!

دیـل كارینگی دەڵێـت: مرۆڤ هیچ كات مانـدوو نابێت، ئەوەی كـە ماندووی دەكات ئیشو كارەقورسەكان نییە، بەڵكو ئەوە تەنها ڕووخانی مەعنەویاتو بە كەم سەیركردنو.. وای لێ دەكات هەست بە ماندووبوون بكات، هەروەها هەندێك سـەیركردن هەیە كە زۆر لە قسـەی ناپەسەند كاریگەرترە، بە زوبانی چاو بە بەرامبەرەكەت دەڵێیت كە تۆڵای من زۆربچووكو بێ نرخیت!

تۆی بەڕێـز كاتێك لەپشـت مێزێكەوە دانیشـتویت، یاخود هەردەسەڵاتێكت هەیە، بە چاوێك سـەیری ئەو كەسـە دەكەیت كە دێت بۆلات بۆ كارێك كە پێویسـتە كارەكەی بۆ ئەنجام بدەیت، بە ڕوانینێك بۆی مەڕوانە كـە تـۆ خـاوەن دەسـەڵاتیت بەسـەریداو ئـازاری مـەدە، دەگونجێـت لـە جێگایەكدا پەشـیمان ببیتەوە لەو هەڵوێستەت كە كاتی بەسـەرچووە، ڕەنگە ئـەوەی تۆ بە بێ نرخ سـەیری دەكەیـت كاری زۆرت پێی بێت لە داهاتوودا، وتراوە: (سوراحی سەر فرو دێنێت لە بۆ پیاڵە كە تێیكا بۆی)، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە كە هەركەس خاوەنی شتێك بوو خاكی دەبێتو خۆی دەسـتی یارمەتی درێژدەكات، نـەك لوتبەرز بێـتو چاوەڕێی بـە گەورە سـەیركردن بێت، چونكە هەموودەسـەڵاتە مادییەكان لە ناودەچن، بەڵام هەڵوێسـتێكی جوامێرانەی تۆ بۆ هەمیشە لە دڵو هەستی بەرامبەرتـدا دەمێنێتەوە، ئەوەش سـیحری مانەوەی تۆیە نەك دەسەڵات!

دیمەن حەیدەر

# بە کێ دەڵێن ڕۆشنبیر؟

هەر یەك لە ئێمە تا ئێستا كەم تا زۆر وشەی ڕۆشنبیری بەر گوێ كەوتووە.. كە وەك سیفەتێك لە سیفاتە پۆزەتیڤەكان دەدرێتە پاڵ كەسێك، كە كۆمەڵێك تایبەتمەندی هەبێت كە لە كەسە ئاساییەكانی دەوروبەری جیا دەكاتەوە. ڕەنگە لای هەندێك كەس خوێندەواری مەرجی یەكەمی كەسی ڕۆشنبیر بێت.. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە بیروبۆچونێكی هەڵەیە.. مەرج نییە هەموو كەسێكی خوێندەوار ڕۆشنبیر بێت.. بەڵام دەتوانین بڵێین زۆرینەی كەسە ڕۆشنبیرەكان، لەناو چینو توێژی خوێندەوارەكاندا دەردەكەون.. هەروەها مەرج نییە هەموو كەسێكی نەخوێندەواریش ڕۆشنبیر نەبێت.. بەڵكو دیاریكردنی كەسی ڕۆشنبیر بە ئامادەبوونی كۆمەڵێك سیفاتی تایبەتیو ناوازەیە لەو كەسەدا.. تا بتوانێت بەخۆی بڵێت ڕۆشنبیر، یاخود لە ڕیزی ڕۆشنبیران ناوزەند بكرێت.. لێرەدا هەوڵمان داوە بە شێوەیەكی گشتی هەندێك سیفاتی كەسی ڕۆشنبیر بخەینە ڕوو:

١- كەسی ڕۆشنبیر بە شێوەیەكی گشتگیر دەڕوانێتە ژیان.. بەو واتایەی هەوڵ دەدات لە گشت بوارەكانی ژیاندا شارەزاییی پەیدا بكات. مەرج نییە شارەزاییی تەواوەتی پەیدا بكات.. بەڵكو بە ئەندازەی ئەوەی پێویستی پێی دەبێت لە كاروبارەكانیدا، یان بە مانایەكی تر ئەگەر هەر ناوێكی نوێ، یاخود داهێنراوێكی نوێ لە هەر بوارێكدا بێت، بێتە كایەوە.. هەوڵ دەدات هەر هیچ نەبێت زانیارییەكی گشتی لەبارەی ئەو شتە نوێیانەوە بزانێتو بە دواشیدا دەگەڕێت.

٢- وەك بینەرێك سەیری فیلمو ڕووداوەكانی ئەم دنیایە دەكاتو هەر ڕووداوو پێشهاتێك لەم دونیایە.. بۆ ئەو جێگەی سەرنجو تێڕامانە.

٣- كەسێكی دادگەرە.. بەو واتایەی كە حوكمی نادادپەروەرانە بەسەر تاكەكانی كۆمەڵگاو دەوروبەریدا نادات.. بەڵكو هەوڵ دەدات لە حەقیقەتی مرۆڤەكان تێ بگات.

٤- سەیری ڕواڵەتی مرۆڤەكان ناكات.. دەوڵەمەندە، یان هەژار، ناشیرینە، یان جوان.. ئەو تەنها بە ئەقڵ مرۆڤەكان هەڵدەسەنگێنێتو قورساییو سەنگیان بۆ دیاری دەكات.

٥- ناخی ڕووناكە.. ڕێگە بە ئارەزووە تایبەتییەكانی نادات تێكەڵاوی نەستو ویژدانو بۆچوونەكانی بن لە بڕیارداندا بەسەر كەسەكاندا. بەو پێیەی بەكارهێنانی ئارەزوو بەرژەوەندییە تایبەتییەكان لە بڕیارداندا ناخو دەروون تاریكو ڕەش دەكات.

٦- ڕقی لە خراپەكار نییە، بەڵكو ڕقی لە هەڵسووكەوتە خراپەكانە كە مرۆڤەكان پەیڕەوی دەكەنو وای لێ دەكەن بە (خراپەكار) ناوببرێت.

٧- حەز بە كارو جموجۆڵو چالاكی دەكاتو لە كاتی بێكاریدا بێزار دەبێتو مەبەستێتی خشتێك بخاتە سەر دیواری كۆمەڵگاكەی، نەك ببێت بە بار بەسەر كۆمەڵگاوە.

٨- لە هەموو هەڵەیەك لە ژیانیدا پەند وەردەگرێت، هەموو ئەم پەندانە دەكاتە ئەزموونێكو لە داهاتوودا سودیان لێ وەردەگرێت.

٩- ڕقی لە خۆ بە زلزانینو خۆ

بــە زلزانــان دەبێتەوە، چونکــە دەزانێت لوتبەرزی لە ئاســت بینینی ڕاستییەکاندا کوێرەو ئەگەر ڕۆژێــك لە ڕۆژان بکەوێتە ســەرزەوی هەســتانەوەی زەحمەتە، لاشی ڕوونــە کــە خــۆ بــە زلزانیــن دوورە لە سرووشــتی مرۆڤــەوە، ئــەوە ســیفاتێکە تایبەتــە بــە درووســتکاری مرۆڤــەوە، نەك خــودی مرۆڤ کە درووســتکراوێکی بێدەسەڵاتە!

١٠- بە شوێن ژیانی تایبەتی کەسەوە نییە، بــە مانایەکی تر بــە دوای عەیبو عارو کەمووکوڕی مرۆڤەکاندا ناگەڕێت، بۆی گرنــگ نییە هیچ لە بارەی ژیانی تایبەتی کەســەکانەوە بزانێــت بــە بێ ئــاگاداری خۆیــان، چونکــە دەزانێت ئــەوە جگە لە خۆ ماندووکردنو کات بە فیڕۆدان شتێکی دیکە نییە.

١١- زۆر وردە لــە لێکدانــەوەی ڕووداوەکانو توانــای خوێندنــەوەی ڕووداوەکانــی دەوروبــەری هەیــەو هەوڵ دەدات زانیاری کۆ بکاتەوە بە پشتبەســتن بــە بنەمــای لێکدانــەوەی هــۆکارو دەرئەنجامەکان.

١٢- ڕێــز لــە هەمــوو کەســانی چــواردەوری دەگرێــت، بــەو پێیــەی کە ڕێزگرتن لە بەرامبەر، پێش هەموو کەس ڕێزگرتنە لە خوود.

١٣- لــە هیچ شــتێکدا هەوڵی تۆڵە سەندنەوە نادات، دەزانێت تۆڵە سەندنەوە نەك تەنها چارەســەری کێشــەکان ناکات، بەڵکو ئاڵۆزتریان دەکات.

١٤- خاوەن کەســایەتییەکی بوێرەو ناتوانێت لە ئاست ناهەقیدا بێدەنگ بێت، لــە کاتی نەبوونــی دادوەریدا هەڵوێســت وەردەگرێت.

١٥- گەشــبینەو باوەڕی بە شکســت نییە لە ژیانیداو شکستەکان وەك ئەزموون تێدەپەڕێنێت.

١٦- توانــای هاوڕێییەتیکــردنو دامەزراندنــی پەیوەندی لەگــەڵ خاوەنی هەموو جــۆرە بیروڕایەکدا هەیە، ئەمەش بەو مانایــە نایەت کە خاوەنــی بیروڕای خــۆی نەبێــت، بەڵکو توانــای وەرگرتنو گوێگرتنی بیروڕای جیاوازی هەیە لەسەر ئــەو بنەمایەی (گەر هەموومان وەك یەك بیر بکەینەوە، کەواتە بیر ناکەینەوە).

١٧- لە شــێوازی قسەکردنو مامەڵە کردنیــدا دوورە لــە بــەکار هێنانی فێڵو تەڵەکەبــازی، بەڵکــو ئەو ســیفەتانە بە تایبەتمەندی مرۆڤــە نەزانەکان دادەنێت، لە جێی ئــەوە لێزانیو لێهاتوویی و هونەر لە شێوازەکانی قسە کردنو مامەڵە کردنیدا بەکار دەهێنێت.

١٨- بــە هیــچ شــێوەیەك لەگــەڵ دەستخستنە نێو کاروباری تایبەتی کەسدا نییەو مەگەر لە لایەن کەســەکە خۆیەوە داوای لێ بکرێت.

١٩- دان بــە هەڵەی خۆیدا دەنێتو لە شوێنی خۆیدا داوای لێبوردن دەکات.

٢٠- بــە ئاســانی توانــای دەستنیشــانکردنی خاڵــە بەهێــزو لاوازو نێگەتیــڤو پۆزەتیڤەکانــی خــۆیو دەوروبەرەکەی هەیە.

٢١- لە زۆر کاتدا پسپۆڕی لە بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا پەیدا دەکات، هەروەها لە گەیشتنی بە ئاستێکی باڵای ڕۆشنبیری دا پەنا دەباتە بەر نووســین بۆ خســتنە ڕووی توانای لێهاتووییەکانیو بەهرەمەند کردنو سوود گەیاندن بە کەسانی تر، بۆیە زۆر کات ئەم دوو ناوە نوســەروو ڕۆشنبیر پێکەوە دەبیستین.

٢٢- لــە چوارچێــوەی کۆمەڵێــك یاســادا کە لــە ژیانی تایبەتــی خۆیدا بۆ خۆی داناوە کار دەکات، پێشی وایە ئەگەر مرۆڤ لە ژیانیدا کۆمەڵێك یاســا بۆ خۆی دانەنێــت، ناتوانێــت پەیڕەوی یاســاکانی دەرەوەی خۆی بــکات، یاخود پابەند بێت بە یاساکانی تری ژیانەوە.

٢٣- بە هــۆی ئــەم تایبەتمەندیو خاڵــە گەوهەرییانــەوە توانایەکی بەهێز بــۆ ڕاکێشــانی زۆرترین کــەس لە دەوری خۆی پەیدا دەکاتو شــوێنی خۆی لە دڵی دەوروبەرەکەیدا دەکاتــەوەو متمانەیەکی زۆر بەدەست دەهێنێت.

بەم شێوەیە دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە ڕۆشــنبیر شــتێکە نەبەسراوەتەوە بە چینێکی دیاری کــراوەوە، یان پلەو پایەو ئاستی ئابوورییەوە، بەڵکو ئەوە سامانێکە هەژارەکانیــش دەتوانن بەدەســتی بهێنن، چونکە بە پارە ناکڕدرێت، ناتوانین بڵێین بەڕەهایــی پێناســەیەکی تەواوەتیمان بۆ کردووە، لەبەرئەوەی ڕۆشنبیر مەودایەکی فراوانتــری هەیە، هەروەهــا ئامادەبوونی ئــەم تایبەتمەندییانــە ڕێژەکــەی لــە ڕۆشــنبیرێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام دەتوانین بڵێین بە گشتی هەموویان لەم خاڵانەدا هاوبەشن.

لە کۆتاییــدا دەمەوێــت بڵێم، گەر ڕۆشــنبیر خاوەنــی ئــەو هەمــوو خاڵــە پۆزەتیــڤو گەوهەریو بــە نرخانە بێت، ئیــدی بۆچــی هەمووومــان هەوڵــی خــۆ ڕۆشنبیرکردن نەدەین؟

م. ئەسعەدی لوڕی زادە

## شۆڕشی زانست

کورد خوێنی لێدەچۆڕێ، من دەوای ڕاســتم گەرەك<br>
جەهــل هێڵەی پێکردیــن، عیلمو زانســتم گەرەك<br>
بەردە دەستی ڕەشبەڵەك، دەستی سەنعەت بێنەکار<br>
قاچی ڕووتــم بۆچییە، من هێزی دەســتم گەرەك<br>
دەنگــی تەقەمەژنــەوە، جیــڕەی قەڵــەم دەرمانە<br>
تــوڕدە فکری نەزانین، شۆڕشــی هەســتم گەرەك<br>
چەنــد هەزارە مە بەندەین، دەبیرێ لە خۆت کەرۆ<br>
گشــت باعیســی نیفاقە، گەلی سەربەســتم گەرەك<br>
لاوی کــورد گەر بێتــەکار، خەوی غەفڵــەت ڕادەکا<br>
هۆشــیاری چارەی منە، کەی گەنجی مەستم گەرەك<br>
خــودا کەداوییــە بــە تــۆ، ئەتــۆش خزمەتێ بکە<br>
کوردســتان وەك جەننەتە، دڵی پەیوەســتم گەرەك<br>
ســاقی ســاقت بشــکێ، لەکیمیاگــەرێ گــەڕێ<br>
تــرێ کەی بۆشــەرابە، دۆشــاوی خەســتم گەرەك<br>
کۆشــکی ئابوری ڕووخا، دەســتی جــەردە باببڕین<br>
لافاوی گەنــدەڵ واهات، بەندو بەربەســتم گەرەك<br>
عەبدی ئەمو ئەو مەبــە، بێگانە کەی وەفای هەس<br>
خواکردییــە کــە کوردی، من خواپەرســتم گەرەك.

# یەکەمینەکان

## بەشی دووەم و کۆتایی

ئا: جەلال جەباری

- یەکەم (هەلی کۆپتەر) لە ساڵی (١٩٣٩) لە وڵاتی (بەریتانیا) دروستکرا لە لایەن زانا (سیکۆرسك)ەوە.
- یەکەم (ڕادار) لە ساڵی (١٩٢٢) لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا، لە لایەن زانا (تیلۆرۆ یۆنگ)ەوە.
- یەکەم (پاسکیل) لە ساڵی (١٨٤٢) لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (ماکمیلان)ەوە.
- یەکەم (باڵۆن) لە ساڵی (١٧٨٢) لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (مۆنگۆلفیما)ەوە.
- یەکەم (پرد) لە ساڵی (١٧٩٦) لە وڵاتی (فەرەنسا) دروستکرا لە لایەن زانا (ڤینلی)یەوە.
- یەکەم (ئۆتۆمبێلی کارەبایی) لە ساڵی (١٨٩٢) لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (مۆرین)ەوە.
- یەکەم (تفەنگی دووربیندار) لە ساڵی (١٩٦١) لە وڵاتی (بەریتانیا) دروستکرا، لە لایەن زانا (فیسك)ەوە.
- یەکەم (تانك - دەبابە) لە ساڵی (١٩١٤) لە وڵاتی (ئەڵمانیا) دروستکرا لە لایەن زانا (ڕۆن بتن)ەوە.
- یەکەم (تەلەگراف) لە ساڵی (١٧٣٢)، لە وڵاتی (ئیتاڵیا) دروستکرا لە لایەن زانا (مۆرسە)وە.
- یەکەم (پاتری کارەبایی) لە ساڵی (١٨٠٠) لە وڵاتی (ئیتاڵیا) دروستکرا لە لایەن زانا (ئەلیکسەنرۆ ڤۆڵتا)ەوە.
- یەکەم ( کاغەز ) لە ساڵی (١٠٥ز) لە وڵاتی (چین) دروستکرا لە لایەن زانا (تسای لوون)ەوە.
- یەکەم (مەصعەدی کارەبایی) لە ساڵی (١٨٨٠) لە وڵاتی (ئەڵمانیا) دروستکرا لە لایەن زانا (هالیسك)ەوە.
- یەکەم (کامێرای ڤیدیۆیی) لە ساڵی (١٩٢٣)، لە وڵاتی (ڕووسیا) دروستکرا لە لایەن زانا (ڤلادیمێر کوزما)وە.
- یەکەم (بۆیەی ڤژ) لە ساڵی (١٩٠٩) لە وڵاتی (فەرەنسا) دروستکرا لە لایەن زانا (تۆجن شۆبەری)یەوە.
- یەکەم (تەرازوو)، (٥٠٠) ساڵ پێش زایین دروستکرا.
- یەکەم (تەلەفزیۆن) لە ساڵی (١٩٣٦) لە وڵاتی (سکۆتلەندا) دروستکرا لە لایەن زانا (بێرد)ەوە.
- یەکەم (کاتژمێر) (١٠٠) ساڵ پێش زایین لە وڵاتی (یۆنان) دروستکرا لە لایەن زانا (ئەندرۆنی کۆس)ەوە.
- یەکەم (تراکتۆر) لە ساڵی (١٩٠٠)، لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (هاڵت)ەوە.
- یەکەم (ڕادیۆ) لە ساڵی (١٨٩٥) لە وڵاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (مارکۆن)یەوە.
- یەکەم (فڕۆکە) لە ساڵی (١٨٦٩) لە وڵاتی (ئیتاڵیا) دروستکرا لە لایەن زانا (جۆنبرا رایت)ەوە.

سەرچاوە /

ئینتەرنێت ماڵپەرەکانی:
(www.aljsad.net,
www.flyingway.com,
ar.wikipedia.org).

نەرمین عومەر

# چەند وشەیەك لە ناخەوە

* تـۆ بەهێزیـت... کاتێـك خـەمو ئەزموونەکانـی پێشـووت دەکەیتـە ئەو خاڵی وەرچەرخانەی ژیانت بەرەو باشتر دەگۆڕێت.

* تـۆ ئازایـت... کاتێـك بەسـەر ترسـەکاندا سـەردەکەویتو یارمەتـی کەسـانی تردەدەیتو لە کاتـی تەنگانەدا بەهانایانەوە دەچیت.

* تۆ بەخشندەیت، کاتێك لەو هەڵانەی کەسانی دیکە خۆشـدەبیت، کە ڕەنگە لە هەر کاتێکدا بەرامبەرت بیکەن.

* تۆ لـە ژیاندایـت... کاتێك هیوای سـبەینێ زۆر لـە هەڵەکانـی دوێنـی گرنگترە.

* تۆ پێشدەکەویت... کاتێك دەزانیت تۆ کێیت، نەك ئەو کەسـەی لە داهاتوودا دەبیت بەچی.

* تۆ دڵخۆشـیت... کاتێـك دەبینیت گوڵـەکان دەکرێنەوە، سوپاسـی نیعمەتە گەورەکانی خوای گەورە دەکەیت.

* تـۆ بەڕێزیت... کاتێك دەزانیت کە ئەم ئاکارەت واتلێدەکات ڕێز لە کەسـانی تر بگریتو نرخیان بزانیت.

* تۆ خۆشەویستیت... کاتێك زمانت، یان پێنووسەکەت بەرەو ئازاردانی کەسانی دیکەت نابات.

* تۆ سەربەسـتیت... کاتێك بەسـەر خۆتدا زاڵدەبیتو ئاواتی زاڵبوون بەسـەر کەسانی دیکەدا ناخوازیت.

* تۆ دەوڵەمەندیت... کاتێك پێویستت بە زیاتر لەوە نییە کە هەتە.

# ڕەحمەتی ڕووناکی

ئاسۆ حاجی

بە هەڵاتنی خۆر، تیشکە زێڕینەکانی سـەرزەمینی درەوشـانەوەو هەمـوو کلۆجێکـی ڕوونـاك بوویـەوە، خوێناوی سـەرپەڕەی گـەڵاکان لەگـەڵ گەرمـی خۆرەتاو بوونە دڵۆپەو دڵۆپی شـەونم لە گۆشەی چاوەکانیان هاتنە خوارێ، شەختە دڵڕەقەکانی سەرشـەقامو کۆڵانەکان بوونە دڵنەرمتریـن بوونـەوەر، هێلانـەی نێو قـەدی درەختێکی باڵابـەرزی بە تەمەن لـە ناو جەنگەڵسـتانا کە بـە گەڵای لقو پۆپی درەختەکان داپۆشرابوو لە شەواندا، تاریك لە شەوی ئەنگوستەچاو دەچوو، لە ڕۆژیشـدا ئەگەر ئەو تیشکە درێژانەی پڕ لـە ڕەحمەتی ڕووناکی نەگەیشـتبوونایە زۆر دوور نەبوو دایکەکان نەتوانن خۆراك بدەن بە بێچووەکانیان.

ئـەو باپیرەیـەش کە هەمـوو کات هەستی بە سەرما دەکرد لە ناخی دڵییەوە، هیچ کات گەرم نەدەبوویەوە، بەڵام کاتێك پشتی دەدا بە تیشکی خۆری هەناسەگەرم هێدی هێدی جەستە ساردو سڕەکەی گەرم دادەهاتو هەناسـەیەکی بـێ هەڵلەرزینی هەڵدەمـژی، داپیـرە پشـت چەماوەکەش کاتێـك زۆر ماندوو دەبوو بۆ پشـوودانی تـاوێ لە بەردەم خۆری زێڕین ڕادەکشـاو سەرخەوێکی دەشکاند.

پیروپەککەوتـەو نەخۆشـی نـاو جێگاکان کە خۆریان دیت چیتر لە مردن نـە ترسـانو باخچەی دڵـە ماندووەکانی چەند ساڵەیان بەرەو خۆشبەختی دەچوو، هەرچەنـد تەمەنیان لە لێـواری دەریای مەرگ بوو.

لاوە خوێـن گەرمەکانیـش دڵیـان ئارام، ڕۆحیان تێرو ئاسودەو ڕووخساریان پڕ لە ڕووناکیو بە ڕەوشت بوون، کچۆڵە خێر نەدیوەکانیش چیتر بە دەستەکانیان ڕیشـی باوکیان داناتەکێنـنو تۆزو خۆڵی بـە سـەرداکراوییان لـە ڕیشـی باوکیان ناکەنەوە.

دایکیش بـوو بە بەرزترین مرۆڤو ڕێزدارترین دروستکراوی بوونەوەر لەسەر بە هەشـتی خوادا ڕاوەسـتا، باوکە دەست لەرزۆكو قلیشـاوەکانیش کەوتنە پشـوو وەرگرتـن، کاتێك ڕۆڵەکانیان پیاڵەیەك لە شـەربەتی ڕۆحیان خواردەوە، دەروونیان ئاسـودە بوو، هەموو ئاسمان بە ئەستێرەو هەسـارەکان، گـۆی زەمینیش سەرپشـتی زەمینو ناخو هەناویشـی ئـارام بوویەوە، پووشو پەڵاشی وشكو دڕکاوی هەڵوەریو گۆپکـەو خونچـەو نەمامـی درەختـی هیواکان کەوتنە گەشـە لەگەڵ گەیشتنی خۆری زێڕینی سەرزەمین.

زاهیر زانا

# ژیان باخەو ئێمەش باخەوان

هەریەك لــە ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیــری بــە لای ئــەو بــەراوردەدا چووەو پرسیاری کردووە، بۆ کەسێك سەرکەوتوو بەختەوەرو خۆشحاڵەو کارەکانی جێبەجێ دەبێتو شادو کامەرانە؟

بۆچی کەســێکی تریش تێکشــکاوو مــاتو مەلــولو دڵتەنــگو غەمگینــەو کاروبارەکانی لاسەنگو ناتەواوە؟!

وەڵامەکــەی زۆر ئاســانە، چونکــە هــەر کەســێکمان باخەوانیــنو زەوی باخــی هەمووشــمان وەك یەکــە، بــەڵام ڕادەی شــارەزایی باخداریمــان جیــاوازەو هەریەکەمــان خەریکــی دروێنەی ئەوەین کــە ڕواندوومانە لە نــاو بیروهزرو ناخی خۆمانو دەوروبەریشماندا، هەر کەسێکمان باخەوانێکــەو باخێکمــان هەیــە کە ژیان نیشــتیمانمانەو ئــەو بیــرو ئەندێشــەو خەونو خولیاو هیوایەی هەمانە وەك ئەو تــۆوە وایە کــە جوتیارێك لــە زەوییەکدا دەیچێنێــتو بەکارهێنانــی ئــەو بەهرەو توانایانەی خوای گەورە پێی بەخشــیوین وەك ئامێــرە کشــتوکاڵییەکانو پــاچو خاکەنــاس وایە، بەردەوامــیو کۆڵنەدانو ماندوونەبــوون بریتین لە بــژارو ئاو بۆ باخی ژیانمان.

کەواتە بابچێنینو بڕوێنینو هەوڵو تێکۆشان بکەین تا ژیانمان باشترین میوە بداتو بیرمان بێت ئەو دارەی لە سێبەری دانیشــتووین، ئەو گوڵەی بۆنــی دەکەین، کەسێك ڕواندوویەتیو ئاوی داوەو خزمەتی کــردووە، دەبێــت وشــیارو بــە ئاگابینو بزانیــن وەرزی چانــدن بەســەردەچێتو هەرکــەس زووتــر بڕوێنێــت زووتــر دەدروێتەوەو ئەو کەســەی باشــتر هەوڵو تێکۆشــان بکاتو بەهرەکانــی بخاتەگەڕو تواناکانی بەکاربهێنێت باخی ژینی سەوزو جوانترەو درەختی بەختەوەریو ئاسودەیی تۆکمەترە.

ئــەو کێڵگەیــەی نەکرێتــە بــاخو گوڵســتانو دانەوێڵــەی بەســوودی لــێ نەچێنین دەبێتە دڕكو داڵی بێ سودو بێ کەڵكو زیانبەخش، زۆر گرنگە ئاگاداربین چ بیرێك لەناو هزرو مێشکماندا دەچێنین، چونکــە چاندن هۆشــیاری دەوێت، ئەگەر کەمتەرخەمبوویــنو تــۆوی ڕووەکێکــی زیانبەخــشو ترســناکمان چاند، بێگومان بەرهــەمو ئەنجامێکــی زیانبەخــشو ترسناکمان دەستدەکەوێت.

مرۆڤــی ســەرکەوتوو بەختــەوەر هەمیشــە ئاگاداری بیرکردنەوەکانییەتی، دەزانێــت دەبێتــە گوفتــارو ڕەفتــارو کردەوەکانــی، ئێمە خاوەنــی ژیری ئاگاو ژیری نائاگاین، هەســتو نەســت (شعورو لاشــعور)، ژیــری بــە ئــاگا ئەوەیــە کــە دەتوانێــت هەڵبــژاردن بــکاتو ڕاســتو چــەوتو چاكو خراپ جیا بکاتەوە، بەڵام ژیری نائاگا هیچ ســودو زیانێك لە یەکتر جیا ناکاتەوەو هەرشتێك لە ڕێگەی ژیری ئــاگاوە پێی بدرێــت جێبەجێــی دەکات، بــۆ وێنــە وەك کرێکارێك وایــە ئێمە بە کرێمان گرتبێتو تــۆو و نەمامی بدەینە دەستو بڵێین بیڕوێنە، ئەویش بێ ئەوەی بپرســێتو بزانێت ئەم نەمــامو تۆوە هی چی شتێکە دەیڕوێنێتو خزمەتی دەکات، ئەگــەر ئــەو نەمامــە بێبەرهــەم بێتو تەنانەت دڕکیش بێت! بۆیە مافی خۆیەتی ئاگاداری وردی ئەم بابەتە هەســتیارەبین هەروەك پێویســتە بزانین چی بە خۆمان دەڵێیــنو چیمان دەوێتو هەمیشــە بیری بــاشو هیــوای ڕەنگینمان بــۆ داهاتووی خۆمان هەبێت، چۆن پێغەمبەری ئیســلام (ســەلامی خــودای لێبێــت) دەفەرموێت: (تفاءلوا بالخير تجدونه).

وەرن هەموو ئێستا بکەینە بەهاری نــوێو هەرکەســێکمان باخــی ژینــی پڕ دانەوێڵــەو نەمامی ســوود بەخش بکاتو خەریکی خزمەتکردنی بێت تا باخی ژینی بەرهەمداربێــتو بەختــەوەرو کامەرانو ئاســوودەبێت، ژیان تێکۆشانو هیواو کاری دەوێت، بۆیە دەڵێین:

ئەگەر دەتەوێت باخی ژیانت  
ئاوەدان بکەیت بە تێکۆشانت  
تابێتە بەرهەم بۆ خۆتو خەڵکی  
بگەی بە بەرو سێبەرو کەڵکی  
دەبێ هەوڵبەی بێ وچانو زۆر  
ئارەق بڕێژی لەبەر تیشکی خۆر  
هەڵگری بێڵو بکەی پاراوی  
هەڵکەنی دڕكو داڵو دێراوی  
بکەی پەرژینی بڕوێنی نەمام  
ئارامت هەبێت ئەگەیتە ئەنجام.

# وەکو شەمەنەفەر بە، هەرگیز ئاوڕ بۆ دواوە مەدەرەوە

و: بێگەرد فارس

ئاواتەخوازیت کە وەکو شەمەنەفەر بیت، بەردەوام بجووڵێیتو بەرەو پێش بڕۆیت، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بۆ ڕابردوو بدەیتەوە، لەگەڵ هەموو وەستانێکدا وزە کۆبکەیتەوەو خۆت ئامادە بکەیت بۆ ڕۆیشتنێکی نوێ، لەم دەستەواژەوە فێر دەبین کە پێویستە وەکو شەمەنەفەر وابین، دەزانن بۆچی؟

بۆئەوەی دڵەکانمان ئارام بێت، هزرو ژیریمان بکرێتەوەو بیروبۆچوونمان سەبارەت بە ژیان بگۆڕێت!

دەزانم دەپرسیت، چۆن دەتوانین ئەم کارە بکەین؟

دڵمان ئارام دەبێت، بە بیرکردنەوە لەو کەسانەی ستەمییان لێ کردووین، لەو کەسانەی دەڕوانن بۆ ژیان بە تێڕوانینێکی پڕ ڕقو کینەوە، بە تێڕوانینێکی ڕەشبینانەوە، بە تێڕوانینێکی لێڵو تاریکییەوە...

نا هەرگیز دڵەکانمان بەو شێوەیە ئارام نابێت، دڵەکانمان پاکترو گەورەترن لەوەی بوغزو ڕقو کینەی تێدا نیشتەجێ بکەین..

مرۆڤ لە سەرەتاوە خاوەن دڵێکی پاکو بێگەردە، بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار هەندێك لە دڵەکان ژەنگو پیسی دەگرنو ڕادەستی کەسانێکی درۆزنمان دەکەن...

ئەوان ئەو کارانە دەکەن، بەڵام پێویستە لەسەر ئێمە بە هیچ شێوەیەك خۆمان بە دەستەوە نەدەین، بانگی هەموو ئەوانەش بکەین کە هەر کارێك دەیانەوێت ئەنجامی دەدەن، پێیان بڵێین: ئێمە زۆر لەوە گەورەترو زیاترین کە مرۆڤێکی ئاسایی بیەوێت بمانگۆڕێت!!

ئێمە بۆئەوەی ژیان لە دڵەکانماندا نوێ بکەینەوەو وەکو شەمەنەفەر بین، پێویستە هەرگیز ئاوڕ بۆ ڕابردوو نەدەینەوە.. هیچ کات بۆ دواوە نەڕوانین، ئەو کات تێڕوانینەکانمان دەبێتە تێڕوانینێکی ڕاستەقینەو ڕاستگۆیانە، بەمەش دڵەکانمان ئاسوودەو ئارام دەبێت.. بیرو هزرمان دەکرێتەوە، هیچ کات نابێت ناوچەی بیرکردنەوەکانمان سنووردار بکەین بە شتێك کە لە ڕابردوودا لە ناوچووە، لەگەڵ هەڵکردنی باداماڵئاوایی کردووە.

پێویستە هیچ کات دانەنیشین پەنجەی پەشیمانی بگەزینو ئاخ بۆ ڕابردوو هەڵبکێشین، کاتەکانمان لە دەست بدەینو بیرکردنەوەمان بەبێ سوود ماندوو بکەین بە شتێکەوە کە هەرگیز ناگونجێتو ناتوانین بیگێڕینەوە، بێگومان دەبێت ئایندەمان زیاتر ڕووناك بکەینەوەو زیاتر فراوانی بکەین، هەروەها پێویستە ڕووداوەکانی ڕابردووی ئازاراوی بپێچینەوەو پەڕەیەکی نوێ هەڵبدەینەوە، بەردەوام بیر لەو شتانە بکەینەوە کە گرنگن لە ژیانماندا، بیرکردنەوەشمان تەنها بە ژیرییەکی ڕاستو دروست دەبێت.

زانایەك دەڵێت: (بیر لە دوێنێ مەکەرەوە، چونکە خۆر ئاوابوو، هەرگیز ناگەڕێتەوە، ئەمڕۆش دوای چەند ساتێکی دی خۆر ئاوا دەبێت، بیر لە سبەینێ بکەرەوە... کە هێشتا خۆر هەڵنەهاتووە).

کەواتە با ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

- عەقڵی گەورەو فراوان، ئەو عەقڵەیە کە درۆو فێڵ نازانێت، هەرگیز بیر لە شکستو ڕووخان ناکاتەوە.

- بە ژیرییەك بیر بکەینەوە کە وەکو شەمەنەفەر وایە، بیر لە ڕابردوو نەکەینەوە، هەرگیز بیر لە گەڕانەوە بۆ دواوە نەکەینەوە..

- هەموو بیرکردنەوەیەکمان بە سوودو نوێیە، هیچ کات بیر لە ڕابردوویەك نەکەینەوە کە لێوان لێوە لە ئازاراو خەمو پەژارە..

- تێڕوانیمان بۆ ژیان دەگۆڕین، دڵو بیرو هەستمان بە بیرکردنەوە لە ڕابردوو سەرقاڵ ناکەین..

- تێڕوانینمان بۆ ژیان دەکەینە تێڕوانینێکی نوێ، تێڕوانینێك لەگەڵ هەڵهاتنی هەموو گزنگێکی نوێدا بگۆڕێت.

- تێڕوانینێکی پاکو بێگەرد بە وێنەی پاکو بێگەردی ئاسمان، تێڕوانینێکی پاك بە وێنەی پاکی ئاوی باران..

- تێڕوانینێك کە پڕ بێت لە گەشبینیو خۆشەویستی، تێڕوانینێك کە هەڵگری پەیامی ڕاستگۆییو جوانترین زەردەخەنە بێت بە سەر ڕووخساری مرۆڤەوە.

- تێڕوانینێك کە ڕابردوومان بیر بەرێتەوە.. لە نێوانیاندا ئازارو خەمەکانی دوێنێمان بسڕێتەوە.

- تێڕوانینێك کە ژیانمان نوێ بکاتەوە، وەکو نوێبوونەوەی گوڵەکانی بەهار..

- تێڕوانینێك کە ڕەنگاو ڕەنگ بێت بە وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی پەلکە زێڕینەی بارانی بەهاران، تێڕوانینێك پڕ لە سۆزو خۆشەویستیو ڕاستگۆیی.

تێڕوانینێك کە هەموو دەرگا خێرەکانمان لەسەر دەکاتەوە.. ژیریو بیروهۆشو دڵودەروونمان ئارام دەکاتەوە.

- تێڕوانینێك وەکو تێڕوانینی شەمەنەفەر تەنها سەیری پێشەوە دەکات، هەرگیز بۆ دواوە ئاوڕ ناداتەوە..

کەواتە با تەنها بۆ پێشەوە بڕوانین، بۆ شتێك کە ژیانمان ڕووناك دەکاتەوە بە ئارامیو خۆشەویستیو دڵسۆزی...

# ساتەکانی مامۆستایەک

هۆزان جەلیل حەمە سەلیم- مامۆستای زانکۆ

ئەو ساتەی نازناوی مامۆستایان پێ بەخشیم، لە هزرمدا بەڵێنم دا کە زۆرینەی کاتەکانی تەمەنم لەگەڵ نەوەیەکدا بەرێ بکەم کە سامانێکی گەورەی نیشتمانن، بەڵێنم دا ئامانجی هەرە گەورەم بەخشینی ئەو زانستە بێت بە خوێندکارەکانم کە پاش بەڕێکردنی تەمەنێکی زۆرو هەوڵو ماندوبوونو شەونخونیو تێکۆشانێکی زۆر بە دەستم هێناوە، تا ئەوانیش لە داهاتوودا ئەو زانستە ببەخشنو خزمەتی مرۆڤایەتیو هاوزمانو دۆستانیانی پێ بکەن، ڕۆژان هاتو ڕۆژان گوزەریان کرد، خەمی هەرە گەورەم گەیاندنی ئەو ئامانجەم بوو بە پایان، بەڵام هەندێك کات هەستم دەکرد زانیارییە بەخشراوەکانم بەفیرۆ چوون سەرەڕای هەوڵو بەخشینی کات بە خوێندکارەکانم.

زۆر کات ئەو پرسیارە دەهاتە پێش، چۆنو بە چ ڕێگایەك هەموو زانستو زانیارییەکانم بکەمە دیاری بۆ خوێندکارەکانم؟ تا بەوپەڕی حەزو تامەزرۆییەوە لێم وەرگرنو لە هزریاندا سات لە دوای سات یاداشتی بکەن، بەڵام بۆ بە دەستهێنانی وەڵامی پرسیارەکان هەوڵو تەقەلاکانم بێ هودەبوو.

ڕۆژێك بۆ چەند ساتێك گەشتێکم ئەنجامدا، بەڵام جیاواز تر لە گەشتەکانی ترم، ئەمجارەیان بۆ کانگای دەروونو ناخی خۆم بوو، ناخم کەوتە گفتوگۆ لەگەڵم پێی ڕاگەیاندم بۆ دەست هێنانی وەڵامەکان ئەستەمە ئەگەر خۆت پێشەنگ نەبیت، هەروەها پێی ڕاگەیاندم ئەرکێکی گەورەو پیرۆزت گرتووەتە ئەستۆ، گرنگە ناساندن لەم ساتەوە ئەنجام بدەیت لەگەڵ خودی خۆت پێش ئەوەی لەگەڵ مرۆڤەکانی دەورو بەرت ناساندنو دۆستایەتی بکەیت، چونکە ئەم کارە هاوکارو یارمەتی دەرتە بۆ دیاریکردنی خاڵە بەهێزو لاوازەکانی ژیانت.

ناخم پێی ڕاگەیاندم ئەو ڕۆژگارەی تۆ هەرزەکاربوویت زۆر جیاوازە لەو چەرخو زەمانەی کە خوێندکارەکانت تیایدا دەژین، چەند گرنگە بە هێمنیو لێزانانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت، پێی ڕاگەیاندم بڕوانە پەنجەکانت چەند جیاوازن، بێگومانیش بە، تۆ وەك مامۆستا، خوێندکارەکانیشت لە بیرو ڕاو بۆچوونو هەستو نەستەکانتان چوونییەك نابن، چەند گرنگە هەستی سینەفراوانیو بەخشینو لێبووردەییو قبوولکردن لە ئاکارەکانی تۆی ئازیز بێت، چونکە ئێوە لە دەرئەنجامی پەروەردەو ژینگە جیاوازەکانەوە هاتوون.

ناخم پێی وتم: لەم ساتە زووتر نییە کە وێنەیەکی نموونەیی بنەخشێنیت، سەبارەت بە چۆنییەتی مامەڵەکردنو گفتوگۆو هاوڕێیەتیو هەستی پەرۆشبوون لەگەڵ خوێندکارەکانت، تا لە ڕۆژێکی نوێی کارەکەدا ئەم وێنە نموونەییە لە خەیاڵەوە بکەیتە واقیع، بە بەردەوامی لە کاری ڕۆژانەدا بەرجەستەی بکەیت.

ناخم پێی وتم: هەوڵ بدە گفتوگۆو پەیوەندی دروست بسازێنیت لەگەڵ خوێندکارەکانت، تا لە دەرئەنجامی ئەمەدا ئەو ڕاوبۆچوونو تێبینیانەی لە کانگای ناخیاندا قەتیس ماوە بۆ تۆی ئازیزی دەربڕن، ئەمەش سەرەتایەك دەبێت بۆ دیالۆگو گفتوگۆ بەردەوامەکانتان، هەمیشە هەوڵبدە پێش ئەنجامدانی گفتوگۆکانت لەگەڵ خوێندکارەکانت لێکدانەوەو شیکاری بۆ وتەکانت بکەیت، چەند گرنگە وتەکانت هەمیشە بیکێشیتو بیبێژیت، پاشان بیهێژیت، چونکە زۆرینەی

کات وتەکانت نیشاندەری ڕەفتارو کەسێتی تۆی ئازیزە.

هەروەهـا ناخم پێی وتم: ئەو کەش‌و هەوایەی دەیسـازێنیت بـۆ گفتوگۆکانت بـا ئازادیی‌و سەربەسـتی‌و ڕێـزو هێمنی تیا بەرجەسـتە بێت، لەسـەر بنەمایەکی دروسـت بێت، تا لە کۆتایی هاوکێشەکەدا پەیوەندییـە ناوازەکان لێك هەڵوەشـانی ئەستەم بێت.

نرخ بۆ وتەو ڕاوبۆچوون‌و پێشـنیاری خوێندکارەکانت دابنـێ، چونکە هەندێك کات ئاسانکارو یارمەتیدەری ئەو گرفتانەن کە درکیان پێ ناکەیت.

زۆرینەی ئەو وەڵامانەی لەم سـاتەدا بە دەسـتت هێنـا بە ئەندامێـك ئەنجام دەدرێت کـە ئەویش زمانە، چەند گرنگە سـوود لەو ئەندامـە وەربگریت بۆ وتەو پەیڤی دروسـت، چونکە سـەرەتایەکە بۆ لەیەکگەیشـتن لەگـەڵ خوێندکارەکانت، سـەرەتایەکە بۆ ئـەو ئامانجە گەورەیەی کـە مەبەسـتە زانسـتو زانیارییەکانـت ببەخشیتە خوێندکارەکانت، چەند گرنگە هەموو پەیڤە دروستەکانت، بکرێتە کردار، چونکە هەمیشـە کـردارەکان دەنگیان لە گوفتارەکان بەرزترە.

دوای چەند سـاتێك بە ئاگا هاتمەوە بەڵێنم دا ئەم گفتوگۆیانە لە ژیانی ڕۆژانەم لەگەڵ خوێندکارەکانم پیادە بکەم، ڕۆژان هـاتو ڕۆژان تێپـەڕی، خوێندکارەکانـم نامەیەکیـان پـێ بەخشـیم کە هەسـتی هەموویـان لە ڕێگـەی پێنوسـێکەوە لە نامەکەدا نەخشێنرابوو، هەستەکان پێیان ڕاگەیاندم تۆ کلیلی دەرگای بەختەوەریت بـە ئێمە بەخشـی، وشـە بـە پێزەکانت ئێمەیان بەرەو خۆشبەختی گەیاند، ئاواتو هیواو ئامانج‌و حەزەکانمان لە تۆدا بەدی کرد، لـە خوێندنگەی تـۆدا فێری وانەی ڕێزگرتـن‌و ڕاسـتگۆیی‌و بەرنامەڕێـژی‌و لێبوردەیی‌و داهێنان‌و پرۆژەسازی بووین، سەرچاوە بوویت تا فێری مانای ژیان بین، فێرت کردین خەمەکانمان کۆچ پێ بکەین‌و بەختـەوەری و کامەرانـی بۆ هەمیشـە بکەینـە میوانی خۆمان، فێرت کردین بە گوفتارە ناوازەکانت هەمیشە هاوڕێی ڕێگە ڕاستەکان بین، ڕێگە چەوتەکان فەرامۆش بکەیـن، ڕێنمایـی‌و ئامۆژگارییەکانی تۆی ئازیـز ڕێبەربوون تا زانسـتو زانیارییە بەسـوودەکانت هەمـووی بەوپـەڕی ئامانەتەوە مرۆڤایەتی‌و نیشتمانمان بەرەو ئاسوودەیی‌و پێشکەوتن‌و ئارامی بەرین.

چەنـد سـاڵ لەمەوبـەر.. میزەڵانفرۆشـێك لە شـەقامەکانی شاری نیـۆرك ڕادەوەسـتا.. تـا میزەڵانەکانـی بفرۆشێت.. ئەو کاتەی خواستو داواکاریی میزەڵانەکانـی دابـەزی‌و فرۆشـی کـەم بووەوە.. میزەڵانێکی هەڵدەدایە ئاسـمان.. کـە میزەڵانەکە لە هەوادا دەسـووڕایەوە.. ئاپـۆڕەی کڕیـاران لـە دەوروبـەری خڕ دەبوونەوەو بۆ چەند خولەکێك، کارەکەی برەوی دەسـەند. ئەو فرۆشیارە، هەستا بە گۆڕینی ڕەنگی ئەو میزەڵانانەی بە هەوادا هەڵی دەدان. ئیدی لە سەرەتادا میزەڵانێکی سـپی هەڵدەدا.. پاشان میزەڵانێکی سوور.. پاشتر میزەڵانێکی زەرد. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك.. منداڵێکی ئەمریکایی بە ڕەگەز ئەفریقایـی، قاپووتی میزەڵانفرۆشـەکەی ڕاکێشا.. تەماشای ناوچەوانی فرۆشیارەکەی کردو پرسـیارێکی هەسـتبزوێنی لێکرد. منداڵەکە گوتی: کاکە.. ئەگەر میزەڵانێکی ڕەشیش هەڵبدەیت.. ئایا دەچێتە ئاسمان؟

فرۆشـیارەکە بە سۆزو خۆشویستی‌و نەرم‌و نیانییەوە.. تەماشای منداڵەکەی کردو بە کارزانی‌و تێگەیشتنەوە، وەڵامی دایەوە: ڕۆڵەگیان، ئەوەی دەفڕێتو بەرز دەبێتەوە، ئەو شـتەی ناو ئـەم میزەڵانانەیە.. کە بە هۆیەوە میزەڵانەکانیش بەرز دەبنەوە.

لە ڕاسـتیدا منداڵەکـە دەرفەتێکی لەبـاری بۆ هەڵکـەوت.. چونکە چاوی بە کەسـێك کەوت، کـە هەر بـە دوو چاوی ناڕوانێـت.. لەبەرئـەوەی بـە دووچـاوی سـاغ دەتوانیت ڕۆیشتن‌و پیاسـە، یاخود ئیـش‌و کار، یان کایەو یـاری.. بەڵام ئەو کەسـەی بە هەر دووچاوو دڵی دەبینێت.. سەرەڕای بینین بە چاو، دەتوانێت هەست بـە ناخی کەسـێکی دیکەش بـکاتو ئەو خێرو چاکەیەی لە ناخیدایە، بیخاتە ڕوو، بیخاتە گەڕ.

بەڵـێ.. هەق بە میزەڵانفرۆشـەکە بـوو.. هەقیش بە منە گـەر بڵیم: ئەوەی لـە ناختدایـە، وات لـێ دەکات.. بفڕێتو بەرزببیتەوە.

لـە کۆتاییـدا ئـەو وتەیـەت بیردەخەمەوە کە دەڵێت:

ئەوەی لە گەیشـتن بەسـەرکەوتن، ڕێگرە.. هزروهۆشـە چـۆڵ‌و دڵ‌و دەروونە وێرانەکانن... نەك گیرفانە بەتاڵەکان.

# تکایە.. بەس سەرزەنشتی خۆت بکە

شاگوڵ عوسمان حوسێن

تــۆ کەســێکی خراپیــت، تــۆ نازانی قســە بکەیت، تۆ توانــای هیچت نییە، تۆ هەرچییەك بکەیت شــایەنی سوپاس نیت، تــۆ چاکەکانــت بــە خراپــە دەدرێتەوە، نازانی تۆ بۆ خۆت بژیت، تۆ هیچ شتێکت لــە خەڵــك ناچێت، تــۆ زۆربێ شــانسو بەختیــت، تۆ توانای هیچ شــتێکت نییە، تۆ کەس حســابت بۆ ناکات، تۆ شایستەی باشــە نیت، تۆ تەکبیــرت پێوە نایەت، تۆ کەس خۆشی ناوێیت، تۆ زۆر چارەڕەشیت، بچیتە ســەر سیروان وشــکی دەکەیت، تۆ زۆر بە گومانیت، تۆ داماویت، تۆ خاوەنی هیچ شتێك نیت، تۆ.. تۆ..

بۆچــی ئەم خەڵکە هێنــدە بە خراپ دەڕوانن لە تۆ؟ دڵنیام سەرسام دەبیت لەم ڕســتە نادروســتانەی بە تۆ دەوترێت بە تایبەتی لە گۆڤارێکی وابەڕێزو مەزندا...

پرســیارێك دەکــەم ئایــا ڕازی دەبیت کــە کەســێك هەمیشــە وا بــە تــۆ بڵێت، هەمیشــە زمانی لــە لۆمەی تۆدا ســەرف بــکاتو تۆش گوێــت لەم لۆمانــەی خۆت بێت؟ من دڵنیــام دەڵێیت: نەخێر؟ ڕەنگە هەندێجارمەســەلەکە بــە خۆشــی کۆتایی پێنەهێنیتو ڕازیش نابیت. ئێســتا لەبری ئــەو جێناوانەی بۆ کەســی دووەم (تۆ) لە ڕســتەکاندا بەکارهاتووە بیکە بە جێناوای کەســی یەکەم (مــن)، پاشــان جارێکی تر بیخوێنــەرەوە... بەســە، بــەس، بۆ هێندە سەرزەنشــتی خۆت دەکەیت؟ بۆ هێندە لە ناخــی خۆتدا لۆمەو زەمی خۆت دەکەیت؟ بــۆ هێندە بە گرانو قــورس دەڕوانیت لە ژیانی خۆت؟ بۆچی ڕازی دەبیت لە نەفسی خــۆت هێندە بــە خراپە نــاوت بهێنێت؟ ڕۆژانــە خــۆت مانــدوو دەکەیــتو ڕۆژی چەندجــار ئــەم بیروبۆچوونــە خراپانە دەدەیت بە گوێی خۆتداو خێرا خێرا لۆمەو سەرزەنشــتی خــۆت دەکەیت، مــن دڵنیام کەسێك هەیە کە زۆرنزیکە لە تۆ گوێت بۆ بگرێت، قسەت بۆ بکات، دەزانی نزیکترین گوێ کە دەبیستێت گوێی خۆتە؟!

نزیکتریــن زمــان بەرامبــەر بە تۆ بدوێ زمانی خۆتە کە قسەی پێ دەکەیت! دڵنیابەو متمانەم پێ بکە (دابنیشــەو گوێ لە خۆت بگرە هەر بە زمانی خۆت، گلەیی مەکە کــە کەس نییە گوێــت بۆ ڕاگرێت، کــەس نییە بدوێت لەگەڵــت، لە خۆتەوە دەســت پێ بکــەو متمانــە بگەڕێنەوە بۆ دەروونــی خۆتو بوار بدە بە تواناکانت)... (چەند بڕی هۆکارەکان بخەیتە سەرشــانی هەر کەسێکی تر بە قەدەر بڕی ئەو هۆکارە خۆت لــە بەرپرســیارییەتی دەدزیتەوە.. ڕاستە ژیان لە ژێر دووهێزدایە کە مرۆڤ بــۆ لای خۆی کێــش دەکات، یەکەم هێزی ڕاکــردن لــە ناڕەحەتــیو دووەم هێــزی تامەزرۆی گەیشتن بە خۆشی..

ئایا ئەو هــۆکارە دەرەکییانــەت دیاری کردووە بۆ خۆت؟ ئایا دەتوانیت بیانگۆڕیت؟ بــە دڵنیاییــەوە نەخێــر.. (بەڕێــز عــادل شاســواری) لە کتێبەکەیــدا دەڵێت: گەر لەو دۆخــە سەرزەنشــتکردنەدا بــەردەوام بیت ئــەوا تۆ بــۆ خۆتو بــە دەســتی خۆت لە زینداندایتو ئازادی بیرکردنەوەت لە دەست داوە لە لایەك هیچ دۆخو کارێکی خۆتت بەدڵ نییەو لە لایەکی تریشەوە لە کارو متمانەی خەڵکانی تر بە گومانیت. (گەر کراسێکت بە دڵ نەبێــت دوای ئەوەی بــە پارەیەکی زۆر

کرپوتە، بەڵام ئامادە نیت لەبەری بکەیت.. ئەی بۆچی ژیانی خۆت بە دڵ نییە کەچی ئامادەنیت بیگۆڕیت، یان سەر لە نوێ دەست پێ بکەیتەوە کە پارەشی تێ ناچێت! یان ئایا هیچ کات بووە تۆ لە تەندروستییەکی باشدا بیتو کەچی بچیت بۆ لای دکتۆر بڵێی نەخۆشم؟! دڵنیام تا نەخۆش نەبیت سەردانی دکتۆر ناکەیت، چونکە بڕوات بەوە هەیە کە نەخۆشیتو دەبێت چارەسەر وەرگریت)، ئێستاش هەوڵبدەو بڕیاربدە کە بیرکردنەوەت تەندروست نییەو دەبێت چارەسەری بۆ بکەیت..

بەڕێز (د. یوسف قرضاوی) دەڵێت: (ئێستا لە نێو ژوورەتاریکەکاندا هاونیشتمانییەکانمانو هاودینەکانمان راپێچی زیندان کراونو دەستەکانیان لە کەلەپچەدان، بەڵام ئەوان هیچ کات ناتوانن مێشکو بیرکردنەوەیان زیندانی بکەن، چونکە ئەوانە تەنها بە جەستە لە زینداندان)، بە پێچەوانەی تۆوە بە جەستە ئازادیت، بەڵام بۆ خۆت دیلی ئەو وتەو مانا نادروستانەیت کە بەدرێژایی کات بە ژیانتدا گوزەر دەکات.

کەسایەتی وەکو ئیزۆکراتیس کە یەکێکە لە پیاوانی فەلسەفەی هاوڕای ئەفلاتۆن، دەڵێت: (چاك بدوێنو دروست بیربکەنەوە)، بیرکردنەوەت بەرامبەر بە خۆت بگۆڕە، دڵنیام بەرامبەر هەموو شتێك دەگۆڕێیت، چونکە کلیلی ژیانێکی دروستو دابینکردنی ئاسایش بۆ خۆت، تەنها بیرکردنەوە دروستەکانمانە.. ئایا تۆ هێندە سەرزەنشتی خۆت دەکەیتو بێبەزەییت بەرامبەر بە خۆت؟ دەبێت چۆن بڕوانیت لە دەوروبەرت؟! دەوروبەر لە چاوی خۆتەوە دەڕوانن لێت، لە زمانی خۆتەوە دەدوێن لەگەڵت، لە گوێی خۆتەوە دەبیستن لێت.. چونکە ئەم وێنانە بوونەتە قاڵبێك لە بیرکردنەوەی خۆتو ڕەنگی داوەتەوە لای دەوروبەرەکەت...

زانایەك دەڵێت: (هەرچییەك دێتە ژیانتەوە خۆت ڕایدەکێشیت، ئەویش بە هۆی ئەو وێنە خەیاڵیانەی لای خۆت دروستت کردووە، کە ئەو وێنانەش هەمان بیروهزرەکانی تۆن، بیر لە هەرشتێك بکەیتەوە ڕاتدەکێشێت بۆ لای خۆی).

بەڕێز (د. ئیبراهیم فەقێ): بۆ ئالوودەبووانی سەرزەنشتکردنی خودی چارەسەری زۆر سانای داناوە، ئەویش بە نووسین (واتە: ڕێنووسی مێشك)، هەرچی ئەو بیروبۆچوونە خراپانەی کە بە بیرتدا دێت سەرەتا بیاننووسە، پاشان بەرامبەرەکانیان وەربگرەو ڕێنوسی مێشکت بکە لەسەر بەرامبەرەکانیان، (بیرتە ئەو کات کە منداڵ بووین، لە تەمەنی پێگرتندا چەندجار کەوتین تا بتوانین بە پێی خۆمان بڕۆین)، سەرەتا کە بەم چارەسەرە هەڵدەستیت تووشی گرژییەکی دەروونی دەبیت لە لایەك مێشکت ئەو ڕاهێنانەی پێ نامۆیەو لە لایەك تۆ سوریت لە سەر بژارکردنی ئەو وشەو ڕستە نەویستراوانە، بەڵام پاش ماوەیەك لەسەر ئەم ڕاهێنانە بەردەوام دەبیت، دەبینیت مێشکت بەتاڵ کردووەتەوەو لە شوێنی ئەوەی بە خۆت بڵێیت: (من توانای هیچ شتێکم نییە.. گۆڕیوتە بە من توانای هەموو کارێکم هەیە)، ڕۆژانە چەند خولەکێك دابنێ بۆ بژارکردنی هەموو ئەو بیرەخراپانە بە.. بیری باش، بە خەیاڵی باش، بە زمانی باش، بە کردەوەو مامەڵەی باش.. من دڵنیام ئەم چارەسەرە زۆر شتت پێ دەبەخشێت.. دەبێت بە لامانەوە سانابێت، چونکە ڕۆژانە چەند کاتژمێرێکت تەرخانکردووە بۆ تەماشای (تی ڤی)یەکانو زنجیرە دراماکان، کە ڕەنگە ژمارەی زنجیرەکان هێندە سەرقاڵت بکات کە سەد شەو بخایەنێت! یاخود شەوانە سەرقاڵی بە ژیانی فلان هونەرمەندو یاریزانو فلان فیلمی ئەکشنەوە!

کەمێکیش بیر لە نووسینی سیناریۆی ژیانی خۆت بکەرەوەو شەوانە زنجیرە بە زنجیرە بە دوای هەوڵو توانای خۆتدا بگەڕێ، ببە بەو ئەکتەرە بە تواناو سەرەکییەی لە درامای ژیانی خۆتداو چاوت بکەرە کامێراو ڤیدیۆی ڕووداوەکانی ژیانت تۆماربکە.. تەنها خۆتی پاڵەوانی دراماو سیناریۆکە). عەودالی خۆت بەو تواناکانت بدۆزەرەوە. دڵنیابە ئەمە دەبێتە گەورەترین سەرەتا لە ژیانی خۆتداو دەبینیت پاش ماوەیەك تۆ کەسێکی هەمیشە لە ناخی خۆتدا هەست بە دڵنیایی دەکەیتو بەختەوەریو گەشبینی ڕووی لە ژیانت کردووە، (پرسیاریان لە شوفێری ئۆتۆمبێلێکی پێشبڕکێ کرد: چۆن توانیت لەو ڕێگە تەسکەی پێشبڕکێدا سەرکەوتن بە دەست بهێنیت؟ لە وەڵامدا وتی: لەو شوێنانەی کە حەزی پێناکەم بۆ ئەو شوێنە دەڕوانم کە دەمەوێت بۆی بڕوانم)! متمانەم پێبکەو هەر ئێستا بڕیاربدەو پێگەی کەسێتی خۆت بدۆزەرەوە.. دڵنیام کە بەختەوەر دەبیت بەوەی کە هەتەو پلانیشت دەبێت بەوەی کە دەتەوێتو ئەوەی ڕۆشتیش هەرچییەك بێت لە خۆت نازدارتر نییەو دەبێتە گەورەترین ئەزموون لە ژیانی کەسێتیتدا، چونکە هەموو مرۆڤێك لە ژیانیدا تووشی کێشەو ناڕەحەتی دەبێتو ناڕەحەتی دێتە ڕێی، بەڵام تەنها جیاوازییەکەی ئەوەیە کە لە نێوان کەسی بەختەوەرو گەشبین لەگەڵ کەسی ئومێدبڕاوو ڕەشبین: ئەویش کەسی گەشبین لە کاتی کردنی هەر کارێکدا خۆی ئامادە دەکاتو گەشبینە بە کارەکەیو هەرکێشەیەکیش بێتە ڕێی بە دوای چارەسەردا دەگەڕێتو هەوڵی دۆخێکی باشتر دەداتو لە ناخی خۆیدا برەو بە خودی دەدات، هەرچەند دەوروبەری ئاگربێت، ئەو مەحاڵە نایەڵێت گڕ ناخی بسوتێنێت، ئەو لە ژیانیدا کارەکان بەوە سەرژمێرناکات کە سەرنەکەوتووە، بەڵکو وا دەڕوانێت کە هەموو ژیانو کۆششەکان بریتین لە هەوڵدان، بەڵام کەسی ڕەشبین لە ژیان بە پێچەوانەوە خۆ ئامادەکردنی نییەو هەمیشە دەم بە گلەییە کە شتەکانی کتوپڕدێنو زووش دەڕۆن)، ناشتوانێت برەو بە خۆی بدات تەنانەت لە کاتێکدا لە دۆخی کارکردندایە بڕوای هەیە کە کارەکەی سەرناگرێتو بۆ خۆی هەر لەسەرزەنشت کردنی خۆی دایەو خۆی پیلان بە خۆی دەگێڕێتو نایەڵێت کارەکەی سەربگرێت! هەرکێشەیەك دێتە پێش بۆی، ئەو بڕوای وایە کە خۆزگەو بریا ئەم کارەی نەکردایە.. هەر زوو دەیزانی کە ئەم کارە بۆ ئەو نییە! گەر سەرزەنشتەکانت بگۆڕیت بە برەودانو هاندان، ئەوا تۆ لە ئێستاوە پیرۆزت بێت بۆ ئەو بڕیارەو بەختەوەریت بۆ خۆت مسۆگەرکردووە، چونکە بڕیارت داوە سنورەکانی ژیانت بخەیتەوە ژێر دەستتو توانا بەدیهێنراوەکانت، خو بدەرە ئەو کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە قسە لەسەر بەختەوەری تۆ دەکەن.. سوپاس بۆخوا.. من دڵنیام (بڕیار) لە خزمەت بەختەوەری تۆدا کاردەکاتو کاری تۆش تەنها خۆت ئاشنا بکەرەوە بە خۆتو ژیانێکی بەختەوەرو خۆشحاڵ چاوەڕێتە لە دەستی مەدە، هەر ئێستا هاواربکە تاهەموو گوێیان لێبێت، یاخود بەرامبەر ئاوێنەکە ڕابووەستەو چاو ببڕە ناوچاوی خۆتو چەند جارێك بە خۆت بڵێ: (من بەختەوەرمو هەوڵی خۆشحاڵی خۆمو چواردەورم دەدەم، بە پشتیوانی خودا) پاشان لەسەر پارچەیەك کاغەز بە دەستو خەتی خۆت بینووسەو هەڵیبواسەو کاری بۆ بکە، من دڵنیامو متمانەم پێبکە تۆ زۆر لەوە بە تواناتریت..

لە کۆتاییدا هیوای بەختەوەریو متمانەی زیاتر بۆ هەمولایەك دەخوازم..

بڕیار

ئا/ ئالان

# ئاو خواردنەوە لای ژاپۆنییەکان

یەکێك لە نەریتە میللیەکانی گەلانی ژاپۆن، خواردنەوەی ئاوە لە هەموو بەیانییەکدا ڕاستەوخۆ دوای هەستان لە خەو.

تاقیکردنەوە زانستییەکان ڕاستیو باشی ئەم ئاکارەیان بۆ چارەسەری چەندین نەخۆشی باوو دیار سەلماندووە، لە هەمان کاتدا خواردنەوەی ئاو چارەسەرێکە بۆ نەخۆشییە هاوچەرخەکانی ئەم سەردەمە، کۆمەڵگەی پزیشکی یابانی بە ڕێژەی لە ١٠٠٪ سەرکەوتنی بەرچاوی لەم بوارەدا بە دەستهێناوە، یابانییەکان بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشیانەی لە خوارەوە ناویان هاتووە ئاو بەکاردەهێنن:

(سەرئێشە، ئازاری جەستە، دڵ، هەوکردنی جومگەکان، لێدانی دڵ بە خێرایی، پەرکەم، ڕەبۆ، سیل، هەوکردنی مێشك، نەخۆشییەکانی گورچیلەو میزەڵان، سکچوون، ڕشانەوە، هەوکردنی گەدە، شەکرە، قەبزی، هەموو نەخۆشییەکانی چاو، منداڵدان، شێرپەنجە، گوێ، لوتو قوڕگ).

چۆنییەتی بەکارهێنانی:

١- بەیانیان کاتێك هەڵدەستیت لە خەو پێش پاککردنەوەی ددانەکانت، چوار پەرداخ ئاو بخۆرەوە، پەرداخی ١٦٠ ملم.

٢- دوای ئەوەی چوار پەرداخ ئاوەکەت خواردەوە، ددانت بشۆرە، پاشان بۆ ماوەی ٤٥ خولەك هیچ خواردنو خواردنەوەیەك مەخۆ.

٣- دوای ئەوەی ٤٥ خولەك بە سەر ئاوخواردنەوەکەتدا تێپەڕی، دەتوانیت خواردن بخۆیت.

٤- پاش تێپەڕینی ١٥ خولەك بەسەر هەر ژەمە خۆراکێکدا (بەیانی، نیوەڕۆ، ئێوارە) هیچ خواردنەوەو خواردنێك مەخۆ تا دوو کاتژمێر.

٥- ئەو کەسانەی بەساڵاچوون، یاخود نەخۆشن، ناتوانن سەرەتا چوارپەرداخ ئاو بخۆنەوە، دەتوانن سەرەتا کەمێك بخۆنەوە پاشان ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی بکەن، تا ڕۆژانە دەگاتە چوار پەرداخ ئاو.

٦- بۆ ئەوەی چێژ لە ژیانێکی تەندروستو لەشساغییەکی باش وەربگریت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی سەرەوە بکە، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی چارەسەری نەخۆشی کە نەخۆشەکان بە دەستییەوە دەناڵێنن.

ئەم خشتەیەی لە خوارەوە هاتووە ژمارەی ئەو ڕۆژانەت پێ دەڵێت کە پێویستە بۆ چارەسەری هەر نەخۆشییەك:

١- پەستانی خوێنی بەرز/ بۆ ماوەی ٣٠ ڕۆژ.

٢- ئازارەکانی گەدە، ١٠ ڕۆژ.

٣- قەبزی ١٠ ڕۆژ.

٤- شێرپەنجە ١٨٠ ڕۆژ.

٥- سیل، ٩٠ ڕۆژ.

٦- نەخۆشییەکانی هەوکردنی جومگەکان، پێویستە هەفتەی یەکەم ٣ ڕۆژ بە کاری بهێنێت، هەفتەی دووەم ٢ ڕۆژ.

بە شێوەیەکی گشتی باشتر وایە بۆ هەر نەخۆشییەك نزیکەی ٤٥ ڕۆژ ئەم جۆرە چارەسەرە بە کاربهێنیت. خاڵێکی دیکە لە خاڵە پۆزەتیفەکانی ئەم جۆرە چارەسەرە میللیە ئەوەیە کە هیچ شوێنەوارێکی نێگەتیف لەسەر کەسی بەکارهێنەر دروست ناکات، تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە سەرەتاوە ڕەنگە ڕێژەی میزکردنی زۆر بێت. باشتر وایە ئەگەر بۆ جارێکیش بێت لە ژیانتدا ئەم چارەسەرە بە کاربهێنیت.

پەندێك هەیە دەڵێت: (ئاو بخۆرەوە، بە لەشساغیو گورجو گۆڵی دەمێنیتەوە).

بەڵام ئاگاداربە کە ئاوی سارد زیانی هەیە، ئەوەی لە گەلانی چینو یابان تێبینی کراوە ئەوەیە کە ئەوان لەگەڵ ژەمە خواردنەکاندا چای نیمچە گەرم دەخۆنەوە نەك ئاوی سارد.

بۆ ئەوانەش کە حەز دەکەن ئاوی سارد بخۆنەوە، پێویستە ئەم ڕێسایە لە یاد نەکەن:

ئەگەر چێژ لە خواردنەوەی یەك کوپ ئاوی سارد وەردەگرن لە پاش نانخواردن، دەبێت ئەوە بزانن کە ئاوی سارد کرداری چەوری خواردنەکان قورس دەکات، کرداری هەرس هێواش دەکاتەوە، هەروەها هەر کاتێك چەوریو ترشەکان کارلێکیان کرد خواردنەکە سوودەکانی لە دەست دەدات، چونکە ڕیخۆڵەکان لە پێش خواردنە ڕەقەکەدا هەڵی دەمژن، کە دەبێتە هۆی ئەوەی ترشەکان بگۆڕێن، ئەمەش مرۆڤ دووچاری نەخۆشی ترسناك دەکات!

باشتر وایەلە دوای ژەمە خواردنەکان ئاوی نیمچەگەرم، بخۆینەوە.

بە هیوای تەندروستییەکی باش بۆ هەمووان.

# خەرمان

ئازاد محێدین/ خورماڵ

(من ئەو مێروودم، پێم لێ ئەماڵن
نەك زەردەواڵە، كەلێم بناڵن
چۆنم بۆبكرێ، سوپاس گوزاری
كەنیمە توانای، مەردووم ئازاری) *
خۆزگە وەك خاكم، واخاكی ئەبووم
بەخاكی ئەژیام، بەخاكی ئەچووم
بامن بترسم، كەس، لێم نەترسێ
بێ غەم، لەغەمی، منا نەپرسێ
دوور لە تەماع و، مایەو سەرمایە
دڵ بە قەناعەت، دەوڵەمەند بووایە
بۆ جوانی دنیا، پێ نەنێم لەداو
وەك مێشی چڵێس، لەهەنگوین گەوزاو
زمانی غەیبەتم، هەڵوێستەی ئەكرد
لەجێی نابەجێ، شوكری خوای ئەكرد
یاگوێی گرانم، تەواوكەڕ ئەبوو
یاخۆ تامەزرۆی، حەق بیستن ئەبوو
دووچاوی وێڵم، بەدوای ئەزەرا
حەقی ئەبینی، لە ژێر سێبەرا
دەستی نووساوم، لە ئاستی ئەدار
سپیو بەخشندە، ئەبوو بە دەستبار
كرداری چاكەم، بەپەنهان ئەكرد
ڕیشەی منەتو ڕیاییم ئەمرد
دووڕوو نەئەبووم، هەروەكو دوو ڕوو
خراپەی پەنهان و چاكەی ڕووبەڕوو
دڵم پڕ ئەبوو، لە نووری خوایی
شەو ڕەویم ئەكرد، شەو بە تەنیایی
ئەلاڵامەوە، لە نیوەی شەودا
بە دیار مەعشوقی، بێ خەوش و خەودا
تا بڕوانامەی، ڕەزامەندی ئەو
بە دەست بهێنم، بە ناڵینی شەو
ئەبووم بەو بەندەی، ملكەچی فەرمان
نەبام شەرمەزار، دەستكەوتی خەرمان
* گوڵستانی سەعدی لاپەڕە ۱۷۸

پەری شێخ کەریم

# لە یەکجیابوونەوەو تێکچوونی نێوان هاوسەران

وشـەی [لێکجیابوونـەوە] ئەو وشـە ناخۆشەیە کە لە دوای خۆی تراژیدیایەك بەجێ دەهێڵێـت، کاتێـك ئەم وشـەیە دەبیسـتین خێزانێکمان دێتەوە یاد پاش ئەوەی ژیانیان لە ژێر سـەقفێکدا بەسەر بردووە، بەڵام لێکترازاونو بناغەی ئەو خێزانە ڕووخاوە!!

بێگومـان دەزانیـن تەبایـیو ڕێـزو خۆشەویسـتی نێـوان هاوسـەران دەبێتە پێکهێنانی خێزانێکی ئاسوودەو سەرکەوتوو، بەڵام پێچەوانەکەی دەبێتە مایەی دابڕانو تێکچوونی شیرازەی خێزان.

بەداخـەوە ئەگـەر سـەرنج بدەیـن دابـڕانو لێکجیابوونـەوەی هاوسـەران زۆر زیـادی کردووە، ئەمـەش هۆکارەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ کۆمەڵە کێشـەیەك کە هەندێجار کۆمەڵایەتی، یا دەروونییە، لەم ژمارەیەدا باسـی ئـەو هۆکارانە دەکەم کە دەبێتە هۆی لە یەکجیابوونەوە، گرنگترین هـۆکاری لـە یەکجیابوونـەوەش (لەیەك نەگەیشـتنە)، ئەمـەش چەنـد بوارێـك دەگرێتـەوە: (جیاوازی لـە بیرکردنەوەدا، یا لە دەربڕینی هەسـتو سۆزداو هاوکات تێنەگەیشـتنی ئـەو بارودۆخانـەی کـە بـۆ بەڕێوەبردنی ژیان پێویسـتن، چونکە تێگەیشتنی هەردوولا لە هەموو بوارەکاندا دەبێتـە زیاتـر دروسـتبوونی پەیوەندی نێوانیان، بەڵام بە پێچەوانەوە ڕووبەڕووی گرفتـی زۆریان دەکاتەوە کە هەندێجار بە لە یەکجیابوونەوە کۆتایی پێدێت.

زۆربەی ئەو هاوسـەرانەی کە تووشی دابڕانو لە یەکجیابوونەوە دەبن دەبینین بـە هۆی نەشـارەزایی لـە مامەڵەکردنو بەجێنەهێنانـی ئـارەزووی یەکترییـەوە بـووە، کە بە داخەوە ئەم جۆرە کەسـانە بە هۆی هەڵەی خۆیانەوە ناتوانن ژیانێکی ئاسـوودە دروسـت بکەنو بەشـێوەیەکی سەرکەوتووانە بژین.

بێگومان هەموو کەس توانای گۆڕانکاری هەیە لە ژیانداو بە قسـەو کرداری جوانی ڕەزامەنـدی بەرامبەرەکـەی بـە دەسـت بهێنێت، بە ڕاستی کەسێك کە خۆی توانای ئـەوەی هەبێت پرۆسـەی هاوسـەرگیری بەدەست بهێنێت لە هەمان کاتدا دەتوانێت بەرپرسـیارێتی ژیانـی هاوسـەرێتی هەڵگرێت، کەواتە پێویستە هەوڵبدات ئەو نارەحەتیو کێشانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە بە توانـای خۆی چارەسـەری بکات، نەك ڕاستەوخۆ بێتوانایی خۆی دەربخاتو حەز بە دابڕانو لە یەك جیابوونەوە بکات.

دووەم هـۆکاری لێکجیابوونـەوەی هاوسـەران دەتوانین بڵێین نەخۆشییەکی ترە کە هاوسـەران تووشـی دەبن ئەویش تووڕەبـوونو بێئارامییـە. بەپێی زۆربەی لێکۆڵینـەوەکان دەرکەوتـووە کە زۆربەی لێکجیابوونـەوەکان بـە هـۆی ئـەم هۆکارەوەیە کاتێك هاوسـەران ڕووبەڕووی کێشەیەك دەبنەوە بە هۆی تێنەگەیشتنو توڕەبوونیانـەوە ناتوانـن کێشـەکەیان چارەسـەر بکـەن، یاخـود لەوانەیـە کێشەکەیان ئاڕاستەی خزموکەسیان بکەن، بەڵام هەندێجار لە جیاتی چارەسەرکردنی کێشەکە گەورەتر دەبێتو نێوانی ئەم دوو هاوسەرە زیاتر دەشێوێت، بەڵام هاوسەرانی بـە ئـارامو بـە توانـا هەمیشـە خۆیان چارەسـەری کێشـەو نارەحەتییەکانیـان دەکەن.

لێـرەدا بـاس لـەو کەمتەرخەمییانە دەکەین کە لە هاوسـەراندا دەبێتە مایەی تووڕەبوونو بێزاری هەردوولا.

لە کەمتەرخەمییەکانی ئافرەت:

* بایەخنەدانـی ئافـرەت بـە ماڵو منداڵو هاوسـەرو گرنگیدان بـە هەندێ شـتی لاوەکـیو لـە بیرچوونـەوەی پێداوستییەکانی هاوسەرەکەی.

* زۆر پارە سـەرفکردن لە شـتی بێ نرخدا، بەبێ پرسکردن بە هاوسەر.

* چوونـەدەرەوەو زۆر گـەڕان بەبێ پرسـکردن بە هاوسـەر، یا هاتوچۆکردنی کەسانێك کە هاوسـەر ڕەزامەندی لەسەر نییە.

* زۆر دەستتێوەردان لە کاروباری هاوسەرداو چاودێری کردنی لە هەموو قسەو کردارێکدا، ئەمەش دەبێتە مایەی نەمانی متمانە بە یەکتری، پاشان دروستبوونی کێشە.

* زۆر دەربڕینی بێزاریو ناڕەزایی لە هەموو پێیداویستی نێو ماڵدا.

* بەکارهێنانی وشەی ناشیرین لەگەڵ هاوسەردا.

* زۆر داواکردنی لێکجیابوونەوە، ئەمەش کارێکی زۆر ناشیرینە، بەداخەوە زۆرێك لە ئافرەتان تووشی هەر کێشەیەك دەبن لەگەڵ هاوسەرەکەیاندا، داوای لێکجیابوونەوە دەکەن، هەندێجار بۆ گاڵتەو ترساندنی هاوسەرەکەی، یا بەڕاستی حەز بە جیابوونەوە دەکات، بەڵام بێگومان پەشیمانی بەدوادا دێت!

زۆر بەداخەوە هەندێك کەمتەرخەمی هەیە ناتوانین باس لە هەموویان بکەین کە بوونەتە شێواندنی چەندەها خێزانو بێنازکردنی منداڵەکان کە چارەسەرکردنیان ئاسانە، بەڵام بێئارامیو کەللەڕەقی هاوسەرەکان وایکردووە بێچارە بمێننەوە!

ئەو کەمتەرخەمییانەش کە لە پیاو دایەو دەبێتە مایەی توڕەبوونی ئافرەت پاشان کێشەو ناکۆکیو دواتر ڕووبەڕووی لەیەکجیابوونەوە دەبن.

* تەماشاکردنی بێڕێزانە بەرامبەر ئافرەتو دوور لە هەموو هەستو سۆزێك.

* زۆر بەسەربردنی کات لە لای هاوڕێو دۆست، بەبێ بیرکردنەوە لە ماڵو منداڵ.

* ڕژدی لە پارە سەرفکردندا، پارە کۆکردنەوەو سەرف نەکردنی بۆ ماڵو منداڵ.

* زۆر قسەکردنو دەنگە دەنگ لە هەموو کارو پێداویستی ئافرەتدا.

* زۆر بەکارهێنانی وشەی (تەڵاق) بە داخەوە هەندێك هاوسەر بە هەموو هەڵسانو دانیشتنی ئافرەت ئەم وشەیە بەکاردەهێنێت.

* دڵپیسکردن لە ئافرەت، واتە گومان لە هەمووقسەو کرداری خێزانەکەی.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خودا هەموو خێزانەکان بە ئاسودەیی بژینو دوور بن لە هەموو کێشەو ناکۆکییەك، بە پشتیوانی خوا لە ژمارەی داهاتوودا باس لە زیانو شوێنەوارە خراپەکانی لێکجیابوونەوە دەکەین لەسەر خێزانو منداڵ.

# ژیان فێری کردم

ژیان فێری کردم: بۆئەوەی بە شێوەیەکی باشو نایاب کار بکەیت، پێویستە:

- لە کاتێکدا لە یەك کار زیاتر نەکەیت.
- کێشەو گرفتەکان دیاری بکە.
- فێرببە چۆن بە گرنگیو پەرۆشەوە گوێ دەگریت.
- فێر ببە چۆن پرسیار دەکەیت.
- فێر ببە چۆن جیاوازی دەکەیت لە نێوان کارێکی گرنگو کارێکی ناگرنگدا.
- قبوڵی گۆڕانکاری بکە.
- دان بە هەڵەکانتدا بنێ.
- فێربە چۆن بە شێوەیەکی ئاسان باس لە بیروبۆچونت دەکەیت.
- فێربە چۆن پارێزگاری لە ئارامیت دەکەیت.
- بە پێی تێڕوانینت بۆ بارودۆخ زەردەخەنە بکە.

ژیان فێری کردم: هەموو ئەو داهێنانە گەورانەی لەم ژیانەدا دەیانبینین، بە بیرۆکەیەك دەستی پێکردووە، سەرەتا زۆر سادە بووە.

ژیان فێری کردم: ئەگەر توانای ئەنجامدانی کاری باشترت هەبوو، کاری باش بەس نییە.

ژیان فێری کردم: کە کردەوەی چاك زۆر چاکترە لە قسەی چاك.

ژیان فێری کردم: کە کێبەرکێ لەگەڵ خودی خۆتدا، گەورەترو چاکترو سەرکەوتوو ترە لە کێبەرکێ لەگەڵ جیهاندا، هەرکاتێك مرۆڤ کێبەرکێ لەگەڵ خۆیدا بکات، ئەو کاتە پێش دەکەوێت کە ئەمڕۆی وەکو دوێنێ نەبێت، هەروەها سبەینێشی وەکو ئەمڕۆ نەبێت.

ژیان فێری کردم: کە شکستخواردووەکان، هەمیشە دەڵێن هۆکاری سەرکەوتن تەنها شەنسو بەختە.

ژیان فێری کردم: زۆربەی ئەو کارانەی ناپاکی دەگەیەنن لە لامان، لە گومانەکانمانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

ژیان فێری کردم: کە دوو ڕێگە هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناڕەحەتییەکانی ژیان، یەکەمیان: دەبێت ناڕەحەتییەکە بگۆڕیت، ئەمەش کارێکی ئاستەمەو ناکرێت، بەڵام لە دووەمیاندا دەکرێت کاردانەوەمان بگۆڕین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕەحەتییەکە.

ژیان فێری کردم: کە باشترین چەکی کاریگەر کە مرۆڤ دەبێتە خاوەنی، بریتییە لە (کاتو ئارامگرتن).

ژیان فێری کردم: پێش ئەوەی هەوڵ بدەیت مرۆڤێکی سەرکەوتوو بیت، پێویستە هەوڵ بدەیت مرۆڤێکی بە نرخ بیت، پاشان سەرکەوتن خۆی بەرەوڕووت دێت.

# کۆتا قسە

و: ڕاز هەڵەبجەیی

من لەم ژیانە بێزاربووم.. من لەوەی کەهەرکات لەسەرئەم سفرەیە دادەنیشم‌و هەمووان بڵێن: (ئێمە تێرین) تا ئەوانی تر بەخواردنی ئەو چێشتە کە هەمیشە لە خۆراکی پێنج کەسی ئەندامانی خێزانەکە کەمترە، تێر ببن ماندووبووم.. تێدەگەی بابە؟ من ئیتر ماندووبووم ئەوەندەم خەفەت خواردووە، تاکاتێك لە خوێندنگە بووم خەفەتم بۆ ئەو جلە تازەو جوانانە دەخوارد کە هاوپۆلەکانم دەیان پۆشی، ئێستاش کە گەنجم خەفەت بۆ ئەوە دەخۆم کە بۆچی من وەکو ئەوان ناتوانم ئۆتۆمبێل بکڕم؟!

نا بابە، ئەو پارەیەی لە کۆمپانیا وەریدەگرم ناتوانێت من بە ئاواتەکانم بگەیەنێت، ئەمانەم گوتو کوپە چاکەی کە دایکم بۆی دانابووم هەڵم گرت تا بڕۆمە ژوورەکەی خۆم بیخۆمەوە، لەوانەیە بمتوانیایە تا چەند ڕۆژێکی تر کارکردنم لەگەڵ خاڵە (وەحید)دا لە خێزانەکەم بشارمەوە، بەڵام لەبەر دوو هۆکار ئەم کارەم نەکرد:

یەکەمیان: ئەوەی کە ئەندازیار ئومێدی -بەڕێوەبەری کۆمپانیا- ئەمشەو یان سبەی شەو باوکمی لە مزگەوت دەبینی‌و پێی دەگوت: کوڕش چەند ڕۆژێکە نایەت بۆ کۆمپانیا!

دوەمیان: خێزانی بوو، مەگەر دەکرا من لەگەڵ خاڵە -وەحید- کاربکەم‌و منداڵەکانی ئەویش بە تایبەتی خاڵۆژن کە ئەوە باشترین بیانوو بوو کە بە هۆیەوە لەگەڵ دایکمدا بکەوێتە قسە هەواڵەکە لە ناو بنەماڵەکەدا بڵاو نەکاتەوە؟!

هەرلەبەرئەوە ئەوشەوە دوای خواردنی نانی ئێوارە بە باوکمم گوت: من ئیتر ناڕۆم بۆ کۆمپانیا.

کاتێك کە ئەو پیرەمێردە پرسی بۆچی؟

وتم: ماندووبووم‌و دوایش کۆتا قسەم کرد:

-خەریکم لەگەڵ خاڵە -وەحید- کاردەکەم.

کوپە چاکە لەدەستمدابوو، هێشتا لە ژوورەکە نەچووبوومە دەرەوە کە بە ئارامی دەنگی باوکمم بەرگوێ کەوت: کوڕش لەم ماڵە بڕۆ دەرەوە، کەسێك کە هاونشینی ئەو پیاوە حەرامخۆرەبێت‌و پارووی حەرامی ئەو بێنێتە ئەم ماڵەوە تەنانەت هەناسەدانیشی دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی ئەندامانی تری خێزانەکە!

باوکم ئەمەی گوت‌و گەڕایەوە ناو ژوورەکە تا دایکم‌و خوشکە بچووکەکەم کە هێشتا زەماوەندی نەکردبوو، بەسەر دەست‌و پێیدا بکەون:

- ئاخر پیاوی باش واباشتر نەبوو بە قسەی خۆش ئامۆژگاری بکەیت‌و ڕێگای ڕاستی پیشان بدەیت؟! بابەگیان کوڕش نەفامە... ئەگەر هەر ئەمشەو چووە ماڵی کەسێکی خراپ‌و لە ڕێگەی ڕاست دووری خستەوە ئەوسا چی؟ دایکم‌و خوشکەکەم خەریکبوون باوکمیان ئارام دەکردەوە، منیش بە پەلە جلەکانم خستە ناو جانتاکەمەوەو کە چوومە حەوشەکەوە وتم: دایەگیان خواحافیز، میناگیان ئەگەر کارێکت بە من هەبوو تەلەفۆن بۆ مۆبایلەکەم بکە، بابەگیان بۆ هەتا هەتایە خواحافیز، ئەمانەم گوت‌و لە حاڵێکدا کە دایکم‌و خوشکەکەم دەگریان کۆتا قسەی باوکمم بیست: نیگەران مەبن، وادیارە خۆشی خواخوای ئەمەی بوو، بۆیە بە پەلە ڕۆیشت.

ئەم قسەیەی باوکم ڕاستبوو، -گیتی- کچی خاڵە -وەحید- بیانوویەك بوو بۆئەوەی من ماڵ بەجێ بهێڵم‌و بڕۆمە شوێنێك کە ساڵانێکە دایکم‌و باوکم پێیان نەخستووەتە ئەو شوێنە.

لەم بنەماڵەیەدا کۆمەڵێك لە خێزانەکان پەیوەندییان لەگەڵ ماڵی خاڵە -وەحید-دا نەبوو، وەکو باوکی من، وەکو برای خاڵە -وەحید- خاڵە -سەعید-... هەموو ئەمانە ساڵانێك بوو بە هۆی حەرامخۆری خاڵە وەحیدەوە پەیوەندییان لەگەڵ خاڵە وەحید پچڕاندبوو! چونکە خاڵە وەحید حەرامخۆرێکی ئاشکراو دیاربوو.

لەبەرئەوەی کە خاڵە وەحید باڵەخانەو سەروەت‌و سامانێکی زۆری هەبوو، هەروەها خۆیی‌و منداڵەکانی ئۆتۆمبێلی جۆراوجۆریان لە ژێردابوو جگە لەو کۆمەڵە خێزانە، خزمەکانی تر خواخوایان بوو خاڵە وەحید پێ بخاتە ماڵیان‌و ئەوانیش مەڕی بۆ بکوژنەوە!

بەڵام چیرۆکی من‌و گیتی چیرۆکی عەشقێکی پاك‌و ڕاستگۆیانەبوو، کە هەر لە ڕۆژانی نەوجەوانیماندا ڕیشەی داکوتابوو.

هەرچەند گەورەتر دەبووین ئەم عەشقە زیاتر ئێمەی لە یەکتر نزیك دەکردەوە، ڕاستیتان بووێت تا ساڵی پاریش نەمدەوێرا ناوی گیتی بێنم‌و لەبەرخۆمەوە دەم گوت:

- من لە کوێ‌و گیتی لە کوێ؟

ئەو ئۆتۆمبێلەی کە ئەو پێیەتی نرخەکەی نیوەی نرخی خانووەکەی ئێمەیە، ئەگەر من ڕۆیشتمە خوازبێنی گیتی‌و خاڵم‌و خاڵۆژنم وتیان تۆ دەتەوێت چۆن کچەکەی ئێمە خۆشبەخت بکەیت؟ چییان پێ بڵێم؟ بڵێم باوکم بەڵێنی داوە هەرکات ویستم ژن بهێنم بە کرێچی ژێر زەمینەکە بڵێت بڕوات‌و ئەوسا ژێرزەمینەکە پێشکەش بە کوڕە تاقانەکەی بکات؟!

هەرلەبەرئەوەش بوو هەمیشە ئاواتەکەمم لە دڵمدا هەڵدەگرت. بیرم نەچێت کە من کەسێکی خەیاڵاویش نەبووم، چونکە چەندەهاجار کاتێك کە گیتی لای دەکردەوەو دەیبینی من بەسەرسامییەوە سەیری دەکەم بە زەردەخەنەیەکی میهرەبانانە وەڵامی دەدامەوە!

بەڵام من بەبێ هۆ عاشقی گیتی نەببووم، چونکە ئەو بە پێچەوانەی دووخوشکەکەیی‌و زۆرێك لە کچانی بنەماڵەکەوە کچی ئاهەنگە جۆراوجۆرەکان نەبوو، هەروەها لووتبەرزو لەخۆباییش نەبوو.

دوای نیوەڕۆ بوو لە کۆمپانیا هاتبوومە دەرەوە بە ڕێگاوە بووم بەرەو ماڵەوە، کامەران کوڕی خاڵە وەحید لەبەردەممدا وەستا، بیرم چوو بڵێم کە بە پێچەوانەی خێزانەکەمانەوە من هێشتاش پەیوەندیم لەگەڵ ماڵی خاڵە وەحید هەبوو، لە ڕاستیدا هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ کامەران‌و کەیهان‌و کیان -کوڕە خاڵەکانم- یاریمان دەکردو پێکەوە بووین، خاڵە وەحید هەر لەو کاتەوە نێوانی لەگەڵ من زۆر خۆش بوو، لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە من وەکو کوڕەکانی زمان لووس‌و زۆرزان نەبووم، وەرزشم دەکردو ئەمسەرو ئەوسەرم نەدەکرد، ئەو هەمیشە بە ئەوانی تری دەوت: ئەم کوڕشە دەبێت لەگەڵ خۆمدا کاربکات تا لە ماوەی دوو ساڵدا بتوانێت نیوەی تاران بکڕێت!

بەم جۆرەبوو کە پەیوەندیم لەگەڵیاندا باش بوو، تا ڕۆژێکیان کامەران سەری خستم‌و پاش حاڵ‌و ئەحواڵ پرسین بە گاڵتەوە وتم:

- چ عەجەب، لەم دەوروبەرانە؟! من بیستبووم کە ئۆتۆمبێلی دەوڵەمەندەکان

بە باشووری شاردا تێناپەڕێت، کامەرانیش پێکەنیو وەڵامی دایەوە: خوا ئەم گیتییەی ئێمە بگرێت وا ئێمەشی دەربەدەر کردووە، ئەکزۆزی ئۆتۆمبێلەکەی کونی تێبووە، پەیداکردنی هاوشێوەکەشی ئاسان نییە، هاتومەتە ئێرە تا بەڵکو پارچەکانی پەیدا بکەم...

هەر لەو کاتەدا بیرم کەوتەوە کە کۆمپانیاکەی ئێمە ماوەیەکە هاوشێوەی ئەو ئەکزۆزەش دروست دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی کڕیاری زۆری هەیە یەکسەر دەفرۆشرێت، بە کامەرانم وت: بڕۆرە ماڵەوەو بە گیتی بڵێ سبەینێ دوانیوەڕۆکەی ئەکزۆزێکی نوێی بۆ دەهێنم.

کوڕە خاڵەکەم بە خۆشحاڵییەوە سوپاسی کردمو ڕۆیشت، منیش خۆشحاڵبووم لەوەی کە دەتوانم کارێك بۆ گیتی ئەنجام بدەم.

سبەینێ دوای تەواوبوونی دەوامی کۆمپانیا بە هەر بەدبەختییەك بوو ئەکزۆزەکەم خستە ناو ئۆتۆمبێلی بارهەڵگرەوەو پارەی ڕۆژێکی کارکردنم دا بە شۆفێرەکەی تا لە بەردەم ماڵی خاڵە وەحید پیادەم بکات. کە زەنگم لێدا گیتی خۆی ئایفۆنەکەی هەڵگرتو وەڵامی دایەوە، یەکسەر ڕۆشتمە گەراجەکەوەو گیتیش هات، یەکەمجار بوو کە بە تەنها قسەم لەگەڵ دەکرد، کەمێك ئەحواڵ پرسینمان کردو پاشان سەرقاڵی دانانی ئەکزۆزەکە بووم، کە کارەکە گەیشتە کۆتایی گیتی بە خۆشحاڵییەوە وتی: کاتێك کە کامەران وتی کۆڕش سەرقاڵی کارکردنە باوەڕم نەدەکرد، بەڵام کە ئێستا کارەکەتم بینی زانیم کە ڕاستی کرد، زۆرباشە ئێستا کە ئیتر خوێندنی ئامادەییت تەواو کردووەو سەربازیشت تەواو کردووەو بوویتە موچەخۆریش ئیتر کاتی ژن هێنانت هاتووە، خۆش بە حاڵی ئەو کچە خۆشبەختەی کە دەبێتە هاوسەری پورزاکەی من، گیتی ئەمانەی وتو لە کاتێکدا کە ڕوومەتی سورهەڵگەڕابوو، زەردەخەنەیەکی کردو سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، ڕۆیشتو منی تەنها بەجێهێشت.

لە دوای ئەوەبوو کە خەیاڵی زەماوەند کردن لەگەڵ گیتی بووبووە خەوو خۆراکم، تەنها شتێك کە ڕێگەی لێدەگرتم کێشەی دارایی بوو. بە خۆمم وت: گیتی هەرگیز ڕازی نابێت بە پارەی شاگردیو لە ناو دووژووری ژێر زەمیندا لەگەڵ من ژیان بەرێتەسەر!

هەر بەمشێوەیەبوو کە دوای دوو مانگ گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر لەگەڵ خاڵە وەحید کاربکەم، نەك تەنها سەروەتمەند دەبم، لە هەمان کاتدا چونکە خاڵە وەحید خۆشی دەوێم، دڵنیام کاتێك بزانێت کچەکەشی منی خۆش دەوێت بە زەماوەندەکەمان ڕازی دەبێت! بۆئەوەی بڕیارەکەم جێبەجێ بکەم سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە ڕۆیشتم بۆ نووسینگەکەی خاڵە وەحیدو ئەویش بە خۆشحاڵییەوە بەخێرهاتنی کردمو بڕیاریدا کە لەسبەینێوە لە نووسینگەکەی خۆیدا وەکو ژمێریار دەست بەکارببمو تا ئەوەی کە شەو داهاتو مەسەلەکەم بە خێزانەکەمان وتو باوکم کردمییە دەرەوە.

کە زەنگم لێدا، گیتی ئایفۆنەکەی هەڵگرت، بەڵام لە جیاتی ئەوەی وەڵامی سەلامەکەم بداتەوە، بەشێوازێکی ناشیرین وتی: هەر لەوێ ڕاوەستە وا هاتم.

دوای ئەوەش بێ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە دوای دەقیقەیەك بە ئۆتۆمبێلەکەیەوە لە دەرگای گەراجەکەوە هاتە دەرەوە، لە لایەوە دانیشتمو کەوتینە ڕێو بەبێ پێشەکی دەستیکرد بە قسەکردن:

- بە درێژایی ئەم پێنج- شەش ساڵە کە هەستم دەکرد خۆشم دەوێیت، هیچ کات بە قەدەر ئەو ڕۆژە خۆشحاڵ نەبووم کە هاتی ئەکزۆزی ئۆتۆمبێلەکەمت چاك کرد، ساتێك سەیرم کردو کە بینیم ڕووخساری تەڕبووە وتم:

-گیتی، تۆدەگریت؟! ئەو کە بەردەوام فرمێسکی دەڕشتو وتی:

-بەڵێ، هۆکاری ئەم فرمێسکانەش کەسێکی نەفامە کە وام دەزانی ئەویش منی خۆش دەوێت، بەڵام.. بەڵێ پورزا، ئەو ڕۆژە کە بینیم دەستەکانت بە هۆی کارکردن بە ئاسنی گەرم تلۆقی کردووەو بینیم هەروەکو پیاوێکی زەحمەتکێش کاردەکەیت، سوپاسی خوام کردو بە خۆمم وت گیتی هەڵەت نەکردووە، پورزاکەت هەرئەو کەسەیە کە تۆ لە خەونەکانتدا دیوتە!

هەرلەبەرئەوەش ئەو ڕۆژە ناڕاستەوخۆ پێم وتی: ئامادەم زەماوەندت لەگەڵ بکەم!

دەزانیت بۆچی؟ چونکە وام دەزانی تۆش وەکو من بیردەکەیتەوەو بڕوات بەو شتانە هەیە کە من بڕوام پێیەتی، بەڵام ئەمڕۆ کە بیستم بڕیارە لەگەڵ باوکە حەرام خۆرەکەمدا کاربکەیت زانیم کە هەڵەم کردووە! بەڵێ ئاغا کۆڕش من لەبارەی تۆوە زۆر هەڵە بووم، لە ڕاستیدا من عاشقی گەنجێك بووم کە دەیویست بە پارەی حەڵاڵ نان بخاتە سەر سفرەکەی، نەك ئەو کەسەی ئەمڕۆ هاتو لەبەردەم باوکە حەرام خۆرەکەی مندا ئەژنۆی دانەواند!

پێش هاتنت مینای خوشکت تەلەفۆنی کردو باسی ئەوەی کرد کە لەگەڵ باوکتدا نێوانتان تێکچووە، مینا زۆر دەمێکە ئاگاداری خۆشەویستی من بەرامبەر بە تۆیە، بەڵام لەبەرئەوەی من سوێندم دابوو تا ئێستا هیچی بە تۆنەووتوە، کاتێك کە مینا پێی وتم ماڵت بەجێ هێشتووە زانیم کە دێیتە ئێرە هەرلەبەرئەوەش خۆم ئایفۆنەکەم هەڵگرت، ئێستاش دەتگەیەنمە بەردەم ماڵی خاڵە وەحیدت، بەڵام لە بیرت بێت کە ئیتر ناوی من نەهێنیت...

قسەکانیم پێ بڕیو وتم: سوێند بە خوا من لەبەرخاتری تۆ دەمویست ئەم کارە بکەم، ئاخر تۆ خۆ ناتوانیت بەو پارەکەمەی کە من هەمە ژیان بگوزەرێنیو لە ژێرزەمینێکی تاریکدا بژیت...

گیتی زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ئەی بۆچی ئەمانەت بە خۆم نەگوت؟ من بیرم لە هەموو ئەمانە کردبوویەوە، هەر ئەو ڕۆژەی کە دایە گەورەم وەفاتی کردو میراتەکەی بە جیا جیا بە سەر نەوەکانی خۆیدا دابەش کرد، تەنها کەسێك کە پارەکەی نەدا بە باوکم تا لە ڕێگەی سودەوە چەندبەرابەری ئەوە بەدەست بهێنێت، من بووم!

من وام دانابوو ئەم پارە حەڵاڵە بخەینە کارێکی حەڵاڵەوەو دوکانێکی نۆژەن کردنەوەی ئەکزۆز دامەزرێنین تا ژیانمان وردە وردە خۆی بگرێت، من تەنانەت ئامادەش بووم لەبەرخاتری تۆ پشت لە خێزانەکەم هەڵبکەم، بەڵام، تۆ.. تۆ، گریانەکەی گیتی زۆرتر بوو وتم:

- ڕاستەکەی من هەڵەم کرد، من زۆر هەڵە بووم، بەڵام لە ڕوویەکەوە هەڵەم نەکردووە ئەویش خۆشەویستی تۆبوو، گیتی من هەموو کارێکم لە پێناوی ئەوەدا کردووە تۆ ببیتە هاوسەرم، واباشترە ئەو ڕووداوانەی کە لە بەیانییەوە تا ئێستا ڕوویداوە لە بەرچاوی نەگریتو تا هەموو شتێك بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی!

گیتی بێدەنگ بوو، پاشان لە ماوەی ئەو کاتژمێرەدا بۆ یەکەم جار پێکەنیو وتی: تۆ هیچ مەڵێ بزانم هێشتاش ماڵی پورم دەزانم، یان نا؟ دوای کاتژمێرێك کە من لە پشتی دەرگاکەوەو لە ناو ئۆتۆمبێلەکەی گیتیدا بووم، ئەو لەگەڵ دایكو باوکمدا دانیشتو تەواوی ئەو قسانەی کە لەگەڵ مندا کردبووی بۆ ئەوانی دووبارە کردەوەو لە کۆتاییدا وتی: هەموو ئەو قسانەی کە لەگەڵ ئێوەدا کردم پێشتر بە کۆڕشیشم وتووە، بە هەرحاڵ ئەگەر ئێوە وابیردەکەنەوە کە کچی پیاوێکی حەرامخۆر بە کەڵکی کوڕەکەتان نایەت!

دایکم دەستی خستە سەر دەمی گیتی وتی: ئەم قسەیە مەکە بوکی گوڵم، کاتێك کە تۆ ڕووت لە خوایە من کێم کە بڵێم نا؟

کاتێك کە دایکمو خوشکەکەم (گیتی)یان لە باوەش گرتبوو و دەگریان، دەرگاکە کرایەوەو دەنگی باوکمم بەرگوێ کەوت: بەمە دەڵێن هاتوچۆی خۆشڕەو، وەرە ژوورەوە کوڕە، ئەمڕۆ کارمان زۆرە.

سەرچاوە/ روزهای زندگی.

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

# کێشەی خەوتن... لای منداڵان

کێشەی خەوتنی منداڵان یەکێکە لەو گرفتانەی کە دایکان بەدەستییەوە دەناڵێنن، بۆ ئاگادار بوونو شارەزایی زیاتر لەم بابەتە ئەم چەند دێڕە دەخەینە بەر دیدی خوێنەرانی ئازیز:

خەوتن دووجۆرە:

جۆری یەکەم: بە نووستنی کلاسیکی ناودەبرێت، یان بە نووستنی هێواش، ئەم جۆرەیان بە دابەزینی خێرایی هەناسەدانو خێرایی لێدانی دڵو دابەزینی خوێنو هاتنە خوارەوەی پلەی گەرمی لەشو دابەزینی داگیرسانی ناوەوەی لاشە جیادەکرێتەوەو جیاوازە.

جۆری دووەم: ئەم جۆرەیان بە خەوی پێچەوانە، یان جۆری زۆر خەوبینین ناودەبرێت، بەخێرایی جوڵەی چاوو قسەکردن لە کاتی خەوبینین، لەم جۆرەیاندا هەموو ئەندامانی جەستە بەشدارنو خێرایی هەناسەدان زیاد دەکاتو خێرایی لێدانی دڵو فشاری خوێنو دەردانی ئەنزیمەکانی گەدە زیاد دەکەن.

هەردوو جۆرەکەی خەوتن لە کەسێکی ئاساییدا لە خولێکی جێگیردا ڕوودەدەن... جۆری دووەمیان لە ماوەی (٩٠) خولەکدا ڕوودەدات، (٢٠) خولەك بەردەوام دەبێت لە هەر خولەکێکدا کەسی خەوتوو لە ٢٠٪ ماوەی خەوتنەکەی لەم جۆرەیاندا بە سەر دەبات.

جۆری یە کەمیان لە خەوتن بە زۆری لە سەرەتای شەودا ڕوو دەدات، بەڵام جۆری دووەمییان درێژە دەکێشێت بۆ کۆتایی شەو.

هەروەها جۆری دووەمیان لە خەوتن بە خەوتنی خەوبینین ناودەبرێت بە هۆی پەیوەندی توندی بە خەوبینینەوە. لێرەدا دەبینین ئەگەر کەسی خەوتوومان خەبەر کردەوە لە کاتی خێرایی جوڵەی چاویدا، یەکسەر پێمان دەڵێت کە لە قوڵایی خەوبینیندا بووە، بەڵگەیەکی تر بۆ ئەم جۆرەیان کە تایبەتە بە خەوبینین هەڵهێنجراوە لە جوڵەی چاوی، وەکو ئەوە وایە کە بەدوای وێنەیەکدا بگەڕێت کە لە خەوەکەیدا دەیبینێت.

زۆرترین خەوبینینی ڕوونو پڕ لە چالاکیو پێویست بۆ ژیانو سۆز، ئەم جۆرەیانە کە ڕودەدات لە کاتی جۆری خەوبینینی دا، هەندێك لە زانایان لەو بڕوایەدان بە هۆی پێویستی مرۆڤ بە خەوبینین (بۆ پڕکردنەوەی شڵەژانی سۆزی) سووره لەسەر وەرگرتنی بەشێك لە جۆری خەوبینین، دەرکەوتووە ئەوەی لەبینینی ئەم جۆرەیان لە کاتێکی گونجاودا ڕوو دەدات، نەوەك لە بەشێکی کەمی کات، وەکو هەندێك کەس وا گومان دەبەن.

ئەو کەسەی دوای (١٠) خولەك لە خەو بە خەبەری دەهێنیت، لەوانەیە لە ناوەڕاستی خەوبینیندا بێت، لەوانەیە بگەڕێتەوە سەر خەو بینینەکەی ئەگەر وازی لێ بهێنین جارێکی تر بخەوێتەوە. ئەم جۆرەیان لە خەو لە ناوەڕۆکیدا ڕێژەیەکی زۆری لە سۆزو کاریگەری کە لەسەر لاشەی مرۆڤ بەجێ دەهێڵێت هەڵگرتووە. ئێمە هۆگرییەکی پتەومان لەگەڵیدا هەیە لە کاتی هەڵسانماندا. ئەو خەوەی ترسو دڵەڕاوکێ دروست دەکات وا لە لاشە دەکات ماددەی (ئەدرینالین) دەربدات، وا لە خەوبین دەکات لە ڕەنگی لێدانی دڵی بە ئاگا بێت. ئەگەر خەوبین خەوی بە پێشبڕکێی تۆپی پێوە بینی، ئەوا بە هەناسە بڕکێ لە خەوەکەی خەبەری دە بێتەوە، یان لە خەوێکی ترسناکدا هەست دەکات لاشەی لە جوڵە کەوتووە. دەڵێن ئەم جۆرە هەستە ڕاستی هەیە لە خەوبینینی کەمدا، لەبەرئەوەی ئاماژەکانی تورەیی لە کۆمەڵێکی دیاریکراوی دەمارەکانمان

ڕادەوەستن بۆ ماوەی نزیکەی نیو خولەك، یان بەم چەشنە دواتر بە یەکجار پاڵ دەنێن، لەوانەیە قاچەکانی خەوبین لە کار کەوتبن تاکو خەوەکە دەگاتە حاڵی ئەوەی کە دەیەوێت ڕابکات، یاخود لە خەوەکەی خەبەری بێتەوە.

خەوبینینی زۆربەی خەڵك لە کاتی خەوی قوڵدا نەوەك لە خەوی سوکدا، ئەگەر مرۆڤ لەم کاتەدا خەوی بینی، خەونەکانیان جیاواز دەبێت، چونکە زۆر بەیان تایبەتن بە کاری ڕۆژانەیان، بە دوورە لە سۆز، ئەم جۆرەیان وەکو بیرەوەرییەکانی ژیان وایە.

کێشەکانی خەوتن لای منداڵان:

ئارەقکردن جۆرێکە لە جۆرەکانی تێکچوونی خەو، زۆربەی منداڵان بە دەستییەوە دەناڵێنن، ئەو منداڵانەی دەناڵێنن بە دەست تێکچوونی خەوو ئارەقکردنو قسە کردن بەدەم خەوەوەو خۆ هەڵگێڕو وەرگێڕان بە درێژایی شەوو هەستان بێ ئەوەی تێر خەوبێتو بە دەست خێرایی هەڵچوونو یاخیبوونو دڵەڕاوکێو تووڕەبوونێکی زۆرو نەمانی خستنەکاری هەستی لەسەر شتەکانو زۆر گریان.

زۆربەی ئەو منداڵانە بەدەست ئەو کێشانەوە دەناڵێنن، ئەم نموونانە دەیان گرێتەوە:

١- بەردەوام هەستانەوەیان لە شەودا.

٢- قسەکردنیان بە دەم خەوەوە.

٣- گرانی بەردەوام بوونیان لەسەر خەوتن.

٤- هەستانیان لە خەو بە دەم گریانەوە.

٥- بەردەوام بوونیان لە خەوتن لە ڕۆژدا.

٦- خەوبینینی ناخۆش.

٧- میز بەخۆداکردن لە خەودا.

ددان گرتنو لێکخشاندنو زوو لە خەو هەستان...

زۆربەی کێشەکانی خەوتن لای منداڵان دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی خەوی نارێك، یان دوودڵی چوون بۆ خەوتن، یان نقوم بوون تێیدا، لەوانەیە کێشەی بەردەوامی خەوتن نیشانەی گرانی سۆز بێت، بۆ نموونە: (دڵەڕاوکێو لێکجیابوونەوە)، ئەمەش نیشانەی پێگەیشتنە بۆ منداڵانی بچووك، بۆ هەموو منداڵانی بچووك، کاتی خەو کاتی لێکجیابوونەوەیە، هەندێك منداڵ بە هەموو توانایان پەنا بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك دەبەن بۆ لێکجیانەبوونەوەیان لە یەکتری لە کاتی خەوتندا.

ئەمەش هەندێك بیروڕایە، لەوانەیە هاوکارت بێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشەیە:

* ئەگەر منداڵەکەت ئارەزووی لەسەر خەو شکاندنێك هەبوو لە کاتی ڕۆژدا، ڕێگەی لێ مەگرە بە بیانووی ئەوەی کە ئەمە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی لە کاتژمێرەکانی خەوی شەو.

*جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت لە منداڵان دەتوانن بە درێژایی ڕۆژ نەخەونو هەر بە خەبەربن، ئەگەرنا زۆربەی منداڵان دەخەون ئەگەر ماوەیەکی کەمیش بێت.

* بە گوێرەی توانا هەوڵی ئەوە مەدە زۆر لە منداڵەکەت بکەیت بخەوێت ئەگەر خەوی نەهات، چونکە منداڵ وەکو کەسی وشیار ناتوانێت بۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکەت بخەوێت... ئەگەر منداڵەکەت حەزی نەکرد، یان لەوانە بوو خۆی تووشی مەترسی بکات، وازی لێبێنە با لای خۆت بمێنێتەوە، تاکو خەو دەیباتەوە، ئەو کاتە بیبە بۆ شوێنی خەوتنی خۆی.

* ژووری خەوتنەکەی بۆ بکە بە شوێنێکی دلگیرو سەرنجڕاکێش، چونکە ژووری نووستن لای هەندێك خێزان تەنها بۆ خەوتنەو بەس، وای لێ ناکەن ببێتە شوێنیکی سەرنجڕاکێشو دلگیر لای منداڵەکەیان، بۆ وێنە با بۆی ببێتە شوێنی یاریکردن، پێش ئەوەی بە تەواوی بخەوێت، جیاوازی بکە لە نێوان ژووری نووستنو خەوتن بە پلە پلەیی، بە گوێرەی توانا هەر لە سەرەتای ژیانی منداڵدا. چونکە ئەو کاتەی منداڵ دەگاتە تەمەنی هەرزەکاری پێویستی بە کاتێکی کەمتر هەیە بۆ خەوتن، حەز دەکات بەشێك لە کاتەکانی پێش ئەوەی بخەوێت بە تەنهایی بە سەریبات بە خوێندنەوە، یاخود گوێ بگرێ لە مۆسیقا.

خەوی ناخۆش:

هەریەکێك لە ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر لە شەودا خەو دەبینین. بەشێکی کەم نەبێت لەو خەونانەمان لە بیر نامێنن، ئەو بەشەی بەبیریشمان دەمێنن لە کۆتایی خەوبینینەکەماندایە پێش خەبەربوونەوەمان.

وەکو پێشتر باسمان کرد ئەو خەونانەی کە لەماوەی ئەو خەوەی کە جیا دەکرێتەوە بە جووڵەی چاو بە خێرایی ئەمەیان سۆزێکە هەڵهێنجراوە لە ئەزموونی ڕۆژانەی مرۆڤدا، لێرەدا منداڵی بچووك هیچ ئەزموونێکی ژیانی نییە ئەم جۆرە خەونانە ببینێت.

لەبەرئەوەی مرۆڤ بە درێژایی شەوگار خەو دەبینێت، جێگای سەر سوڕمان نییە کە هەندێکیان ترسناك بن، ئەو کەسانەی وا گومان دەبەن کە خەوی ناخۆش نابینن ئەوان لە ئێمە هاوسەنگ تر نین. بەڵکو ئەوان خەوە نا خۆشەکانیان لە یاد نامێنێت.

ئەو منداڵانەی خەوی ناخۆش دەبینن، کاتێك لە خەو بە خەبەر دێن دەگرین، یاخود هاوار دەکەن، هاوارکردنو گریان ڕەنگدانەوەی خەونەکەیەتی، لەم کاتەدا پێویستە زوو بچیت بۆ لای مندڵەکەتو هێوری بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر نەچیت بۆ لای ئەوا ترسەکەی زیاد دەکات، ئەگەر سەرجەمی خەونەکەشی لە یاد نەمێنێت، ئەوا ئەو ترسەی هەر لە یاد دەمێنێت کە بە هۆی خەوە ناخۆشەکەیەوە تووشی هاتووە، لە زۆربەی کاتەکاندا منداڵ دووبارە خەو دایدەگرێتەوەو دەخەوێتەوە، بە خێرایی بەس گوێی لە دەنگی تۆ بێت، یان هەست بە دەست بەسەرداهێنانی تۆ بکات ئارام دەبێتەوە.

هەوڵی ئەوە لەگەڵ منداڵەکەتدا مەدە کە خەونە ترسناکەکەت بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو خۆی هەوڵی گێڕانەوەی دا، ئەوا با بە ئارەزووی خۆی بیگێڕێتەوە.

پێداگری مەکە لە منداڵەکەت هەست بە مانەوەی تۆ بکات لە لای، بەڵام لە شوێنی خۆتدا بۆ چەند ساتێك بمێنەوە، لە ترسی ئەوەی ئەوەیان لە لایەنە دەگمەنەکان بێتو دووبارە بێتەوە.

ئەگەر منداڵەکەت حەزی کرد لە قەرەوێڵەکەی بێتە خوارەوە، هەوڵ بدە ڕێگری لێبکە لە هاتنە خوارەوەی، بەڵام بە نەرمونیانی. ئەگەر هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی دا، یان ویستی هەڵبچێت بەرامبەرت، تۆ هەر بەنەرمی لەگەڵیدا بجوڵێرەوە، لەم کاتەدا پێویستە ڕووناکی ژوورەکە داگیرسێنیت، سەرینەکەی بۆ بگۆڕەو هاوشێوەی ئەم هەڵسوکەوتانەی لەگەڵدا بکە، ئەوە وای لێ دەکات هەست بە ئارام بوونەوە بکات.

خەوە ناخۆشەکەیو ترسی شەو ڕوودەدەن لە ئەنجامی ئەو ئەزموونەی منداڵ ڕۆژانە تێیدا دەژیت، ئەوە تەنها هەستکردنە بە ئازار لە ئەنجامی ئەزموونێك لە ئەزموونەکان. نموونە بۆ ئەم ئەزموونانەش وەکو: کاتێك منداڵ دایکی ببینێت ببوورێتەوە، یاخود منداڵەکە پێویستی بە نەشتەرگەری کردن بێتو هەوڵی گرتنی بدرێت لە لایەن کەسوکارییەوە.

هەمان شت دووبارە دەبێتەوە کاتێك منداڵەکە دیمەنێکی ترسناك لە تەلەفزیۆن دەبینێت، یان ئەو چیرۆکانەی بۆی دەگێڕنەوە، ئەو خەو بە هەموو شتێکەوە نابینێت، تەنها خەو بەو ترسەوە دەبینێت کە گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە سەر هەستی دروستی کردووە.

بەشی یەکەم

# خۆشەویستی ڕاستەقینە

درەخشان بەهادین محەممەد

پیاوێکی دێهاتی هاوسەرەکەی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی دەبات بۆ گەورەترینو بەناوبانگترین نەخۆشخانەی شار، بە هۆی پێشکەوتوویی‌و ناوبانگی نەخۆشخانەکەوە خەرجی خەواندنو نەشتەرگەری زۆر گران بوو، پیاوەکەش لە پێناوی سەلامەتی گیانی هاوسەرەکەی ئامادە بوو هەموو سەروەتەکەی بدات، یەکێك لە پەرستارەکانی نەخۆشخانەکە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو پیاوە هەموو ڕۆژێك دوای نیوەڕوان، دەچووە لای تەلەفۆنە گشتییەکەوە کە بەرامبەر ژووری هاوسەرەکەی بوو، تەلەفۆنی بۆ ماڵەوەیان دەکردو بە دەنگی بەرز دەیگوت: کوڕی ئازیزم، کچی شیرینم، حاڵتان باشە، تەندروستیتان، باروگوزەرانتان چۆنە؟ مەڕەکانتان بردووە بۆ لەوەڕگا؟ ئاگاداری مانگاکە بن، زۆر باشە ئاگاداری خۆتان بن، دایکتان تەندروستی باشترەو بەم زووانە بە ویستی خودا دەگەڕێینەوە ماڵ!

پەرستارەکە دەڵێت: بە درێژایی ئەو مانگەی کە ئەو ژنو مێردە لە نەخۆشخانەکە بوون، هەموو ڕۆژێك پیاوەکە ئەم ڕەفتارەی دووبارە دەکردەوە، بە دەنگە بەرزەکەی تەواوی نەخۆشەکانو پەرستارو پزیشكو کارمەندانی نەخۆشخانەکەی بێزار دەکرد، چەندین جار پێمان دەگوت کە لەسەر خۆ قسە بکاتو هاوار نەکاتو دەنگی نزم بکاتەوە، بەڵام بێ سوود بوو، ئەو ڕۆژانە هەر لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو، بە پێداگری‌و کەللە ڕەقی‌و دەنگی بەرز ڕۆژانە هەمان ئەو قسانەی دووبارە دەکردەوە!

دوای چەند ڕۆژێك پزیشکەکان ژووری نەشتەرگەرییان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ ژنەکە ئامادەکرد، ژن بەرلەوەی بچێتە ژووری نەشتەرگەرییەکە لە پڕ دەستی پیاوەکەی گرتو بەدەم گریانەوە وتی: (ئەگەر نەگەڕامەوە ئاگات لە خۆتو منداڵەکان بێت)، پیاوەکە بە میهرەبانییەوە دڵنەوایی کردو وتی: (هێندە بێ ورە مەبە). بەڵام من هەستم کرد کەمێك ڕووخساری تێکچوو بوو، دوای تێپەڕبوونی (١٠) کاتژمێر، پەرستارەکان ژنێکی بێ هەستو جوڵەیان گەیاندە ژوورەکە، نەشتەرگەرییەکە بەسەرکەوتویی ئەنجامدرا بوو، هاوسەرەکەی بە سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکە زۆر خۆشحاڵ بوو، کاتێك هەموو شتێك ئاسایی بوویەوە، چووە دەرەوەو شەو درەنگانێك گەڕایەوە بۆ نەخۆشخانە، پیاوەکە ئەو شەوە وەك شەوانی پێشوو تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە نەکرد، تەنها لە تەنیشت قەرەوێڵەی خێزانەکەیدا دانیشتوو نوقمی تەماشای ئەو بوو کە هێشتا بێهۆش بوو.

بەیانی ڕۆژی دوایی ژنەکە هاتەوە هۆش خۆی، لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا نەیدەتوانی قسە بکات، بەڵام حاڵی باش بوو، دیسان مشتومڕی ژنو مێرد دەستی پێکردەوە، ژنە دەیویست لە نەخۆشخانە

بچێتە دەرەوەو پیاوەکە دەیویست لە هەمان شوێن بمێنێتەوە، هەموو شتێك وەك جاران درێژەی کێشا، هەموو شەوێك پیاوەکە تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە دەکرد، هەمان دەنگی بەرزو هەمان ئەو قسانە دووبارە دەبوونەوە.

پەرستارەکە دەڵێت: ڕۆژێکیان ناچار بووم بۆ کارێکی پێویست تەلەفۆن بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی بەڕێوەبەری نەخۆشخانە لە بەکارهێنانی تەلەفۆنی نەخۆشخانە بۆ کاری تایبەت زۆر توند بوو، ناچاربووم بڕۆم لە تەلەفۆنی گشتییەوە پەیوەندی بکەم بۆ ماڵەوە، کاتێك چوومە لای تەلەفۆنە گشتییەکە هاوسەری ژنە نەخۆشەکە وەکو ڕەفتاری هەموو ڕۆژێکی تەلەفۆنی دەکردو هەمان قسەی ڕۆژانی دووبارە دەکردەوە، منیش ناچاربووم چاوەڕێ بکەم تا ئەو لە قسەکانی ببێتەوە، لە ناکاو حەپەسام، سەیرم کرد کاتێك ئەم پیاوە قسە دەکات هیچ کارتێك لە نێو تەلەفۆنەکەدا نییە، ئەی کەواتە چۆن دەتوانێت بەبێ بەکارهێنانی کارتی تەلەفۆنی پەیوەندی بکات؟!

ئیدی من ئەو کات تێگەیشتم کە ئەم کەسە ئەو هەموو تانەو تەشەرو توانجەی ئێمەی قبوڵ کردووە، تەنها بۆئەوەی خێزانەکەی دڵنیا بکاتەوە کە لە نەبوونی ئەودا منداڵەکانی سەلامەتن‌و بۆ خەرجی نەشتەرگەرییەکە مەڕەکانیان نەفرۆشراون، تا وا هەست بکات دوای دەرچوونیان لە نەخۆشخانە دەڕۆنەوە سەر ماڵە خنجیلانەکەی خۆیان‌و وەکو جاران بژێوی ژیانیان بە هۆی مەڕو ماڵاتەکەیانەوە بە ڕێ دەکەن...

خوێنەری ئازیز، ئێوە هیچ زانیارییەکتان لەسەر تەمەن‌و ئاکاری ئەو ژن‌و مێردە نییە، بەڵام لەدوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو ژن‌و مێردە، دەپرسم: ئایا ئەو پیاوە خێزانەکەی خۆی خۆش دەوێت؟ چەند؟ بۆچی؟

دڵنیام لەوەی کە هەموومان وەڵامێکی وەك یەکمان بۆ ئەو پرسیارە هەیە، لە ڕاستیدا ئەم پیاوە هاوسەرەکەی خۆی زۆر خۆش دەوێت، هەر لەبەر ئەو بوو، بە درێژایی یەك مانگ ئەو هەموو توانج‌و تەشەرەی کارمەندانی نەخۆشخانەی قبوڵ کرد، ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی خۆشویستن.

هەر بۆیە دەڵێم خۆشویستن هەزار شێوەی هەیە، بە وتنی ڕستەی (خۆشم دەوێیت!) تەنها یەکێکە لە شێوەکانی خۆشەویستی، بە وتنی تەنها وشەیەك هەرگیز ناتوانی عەشق‌و ئەوینی ڕاستەقینە بسەلمێنیت.

ئێستا سەرنجتان بۆ چیرۆکێکی دیکەی ڕاستەقینە ڕادەکێشم:

کوڕێك زۆر شەیداو هۆگری کچێك بوو، بۆ نواندنی ئەندازەی ئەوینی ڕاستەقینەو دڵداری خۆی دەیان لاپەڕە هۆنراوەی بۆ خۆشەویستەکەی نووسی بوو، ئاوازی جۆراو جۆری بۆ دانابوو، تا مەعشوقەکەی بزانێت چەندە شەیداو ئەوینداریەتی!

ڕۆژێکیان ئەم دووانە پێکەوە بە پاسێك بە مەبەستی ئاشنایی زیاتر بە خزم‌و کەس‌و کاری یەکترو دواتر دەستپێکردنی ژیانی هاوسەرێتی بەرەو شار دەکەونە ڕێ، ڕێگای چوونیان شاخاوی بوو، هەر بۆیە پێچاوپێچی زۆری هەبوو، لە یەکێك لە پێچەکاندا لە ناکاو ئیستۆپی ئۆتۆمبێلەکە لە کارکەوت، شۆفێرەکە بە شپرزەییەوە بەسەر سەرنشینەکانی نێو پاسەکەدا هاواری کردو وتی: ناتوانم ئۆتۆمبێلەکە کۆنترۆڵ بکەم، هەر بۆیە هەر کەس کەوتە خەمی خۆی‌و کارێکی کرد، دایکێك بە توندی منداڵەکەی لە باوەش گرتو لە ڕاڕەوی پاسەکەدا دانیشت، پیاوێك هاوسەرەکەی لە ئامێز گرتو بەرەو بەشی دواوەی پاسەکە هەڵهاتن، کچەکەش لە ترساندا ویستی پەنا بەرێتە لای خۆشەویستەکەی تا کەمێك لە ترسەکەی بڕەوێنێتەوە، بەڵام کوڕەکە بە هەراسانییەوە پاڵی پێوەناو لە خۆی دوورخستەوە، بێ گوێ دانە هاوارو پاڕانەوەی کچەکە، بۆ سەلامەتی گیانی خۆی، خۆی گەیاندە دەرگای پاسەکە، لە دەرفەتێکدا خۆی هەڵدا!

بەڵام خۆشبەختانە شۆفێری پاسەکە بە هاوکاری یاریدەدەرەکەی توانی پاسەکە لەسەر تەپۆڵکەیەکی لماوی ڕابگرێت، کاتێك پاسەکە وەستا، هەمووان لە خۆشیا نەیان دەزانی چی بکەن، کوڕەکەش بە ڕاکردن خۆی گەیاندەوە پاسەکەو ڕۆیشت بۆ لای کچەکەو بە زمانی لووس‌و زۆر زانانە پاساوی بۆ کارەکەی خۆی هێنایەوە، کچەکەش بە پێکەنینەوە وتی: سوپاس بۆ خودا بەر لە گەیشتنمان ئەندازەی خۆشەویستی‌و پەیوەست بوونی تۆم سەبارەت بە خۆم بۆ دەرکەوت!

ئێستا ئێوە بڵێن: ئایا ئەو کوڕە بە ڕاستی کچەکەی خۆش دەویست؟ چەند؟ بۆچی؟

ئەی ڕاتان سەبارەت بەو دایکەی کە جگەرگۆشەکەی بە توندی لە باوەش گرتو لە ڕاڕەوی پاسەکەدا دانیشت چییە؟

ئەی ئەو پیاوەی کە هاوسەرەکەی لە ئامێز گرتو پەنای بۆ بەشی دواوەی پاسەکە برد؟

ئێستا با پێکەوە شێوە جیاوازەکانی خۆشەویستی ڕاستەقینە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دوو چیرۆکەی سەرەوە بخەینە ڕوو:

* نیگەران بوونی سەلامەتی جەستەی بەرامبەر.

* نیگەرانی ئارامی‌و ئاسوودەیی بەرامبەر.

* هەوڵدان بۆ هێنانەدی‌و بەرقەرارکردنی ئارامی‌و پشووی ڕۆحی‌و دەروونی‌و جەستەیی کەسی بەرامبەر، ئەگەر بە نرخی قسەو توانج‌و گاڵتە پێکردن‌و بریندار بوونی خۆشت بێت.

* هەوڵدان بۆ پاڵپشتی کردن‌و پارێزگاریکردنی کەسی بەرامبەر ئەگەر بە لە دەستدانی گیانی خۆشت بووبێت.

* فیداکاری‌و لە خۆ بووردن لەبەر خۆشەویستی کەسی بەرامبەر.

* قبوڵکردنی ڕەنج‌و زەحمەت‌و هەوڵدان بۆ شادکردن‌و دڵخۆشکردنی بەرامبەر لە ژیاندا.

هەڵبەت ئەم لیستە بەردەوام دەبێت، بە هەر چیرۆك‌و بەسەرهاتێکی تری ئەویندارانە کە لەم گەردوونەدا ڕوو دەدات، ئێوەش دەتوانن دەیان ڕستەو نیشانەی تر بۆ ئەم لیستە زیاد بکەن، بەڵام ئەوەی کە گرنگە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵەیە کە عەشق‌و خۆشەویستی هەزار شێوەو شێوازی هەیە، هەرگیز نابێت بە چەند وتەو ڕستەیەك کە گوێبیستی دەبین، یا بە چەند نیگاو پێکەنینێك وا گومان بەرین کە بەڕاستی لە ناو ئەزموونی بەرزو شکۆداری عەشق‌و موحیببەتی پاك‌و ڕەسەن داین.

ئەمە ئەو خاڵەیە کە لەم باسەدا مەبەستمانە کە خاڵی کردنەوەو دەستپێکی ڕێگای سێیەمە، تا بزانین هەمیشە جگە لە دوو ڕێگا دیارو دوو جەمسەرییەکەی گشت بوارەکانی ژیان‌و ڕێگایەکی ترو سێیەمیش هەیە بۆ ئەزموونکردن‌و بەردەوام بوونی ژیان.

ئا: بەرزان ئەبوبەکر

# هەڵەی کەسانی دی دووبارە مەکەرەوە!

ئالوودە ببوو بە کڕینو فرۆشتنو بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، سەرەنجام دووچاری زیندان بوو، دادگا بە تۆمەتی بەکارهێنانو مامەڵەکردن بە مادده هۆشبەرەکانەوە، فەرمانی زیندانی هەتا هەتایی بە سەردا دا!

ئەمە چیرۆکی گەنجێکی تازە پێگەیشتوو نییە، بەڵکو باسی کەسێکە کە تەمەنی لە نێوان ٥٠-٦٠ ساڵیدایە، خاوەنیماڵو منداڵەو ئەزموونێکی لە ژیاندا هەیە، بە هەرحاڵ زۆر بە سەر ئەم ڕووداوەدا تێنەپەڕی، کوڕی یەکەمی بە هەمان تۆمەت خرایە زیندان، ئەویش دادگا بە وێنەی باوکی فەرمانی هەتا هەتایی بەسەردا دا!

بەڵام کوڕی دووەمی بە پێچەوانەی باوکیو برا گەورەکەیەوە، قۆناغەکانی خوێندنی بە سەرکەوتوویی تەواو کردو بوو بە بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیا بە ناوبانگەکانی شارەکەی!

توێژەرێکی کۆمەڵایەتی ویستی توێژینەوەیەك لەسەر ژیانی ئەم خێزانە ئەنجام بدات، سەرەتا چووە لای کوڕی یەکەم کە بە هەمان تۆمەتی باوکی خرابووە سووچی زیندان، لێی پرسی: هۆکاری گەیشتنت بە زیندان چی بوو؟ چاوەڕوان دەکەیت چ وەڵامێك بداتەوە؟!

زۆر بە ئاسایی وتی: لە کاتێکدا باوکم بە تۆمەتی مامەڵەکردنو بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان فەرمانی هەتاهەتایی لە زینداندا هەیە، ئیدی چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت؟!

پاشان توێژەرەکە ڕۆیشت بۆ لای کوڕی دووەمی ئەو پیاوەو لێی پرسی: چۆن توانیت ببیتە بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیا بە ناوبانگەکانی ئەم شارە؟

لە وەڵامدا گوتی: باوکم ئالوودەی مادده هۆشبەرەکان بوو، ئێستاش بەو تۆمەتە فەرمانی زیندانی هەتا هەتایی هەیە، ئیدی چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت؟!

ئێستا با پێکەوە بیربکەینەوە، بە وردی سەرنج لەم دوو وەڵامە بدەین، هەمان وەڵام، هەمان ڕووداو، دوو کوڕی یەك خێزان، یەکەمیانی گەیاند بە هەمان شوێنی باوکیو دووەمیانی کردە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك!

دەزانم هەمووومان دەپرسین چۆن؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، کوڕی یەکەم وا بیری کردۆتەوە کە گیا لەسەر بنچی خۆی دەڕوێتەوە، ئیدی هەر بۆیە بە هەمان ڕێچکەو ڕێبازی باوکیدا ڕۆیشتووەو هەمان سیناریۆی باوکی لە ژیاندا دووبارە کردووەتەوە، هەربۆیە دەڵێت: ئەگەر من کوڕی ئەو باوکە بم هەر ئەوەم لێ چاوەڕوان دەکرێت، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە سەرەنجام دووچاری هەمان چارەنووسی باوکی ببێت!

«زۆرجار نەوەکان هەمان ئەو کارە دووبارە دەکەنەوە کە باوکیان ئەنجامی دەدات، بۆ وێنە ئەگەر باوکی کەسێکی جگەرەکێش بێت، ئەویش چاو لە باوکی دەکاتو دەبێتە کەسێکی جگەرەکێش، ئەگەر پێی بڵێی جگەرەکێشان زیانی زۆرە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ، بۆچی لەم تەمەنەوە دەستت داوەتە جگەرەکێشان؟ ڕەنگە لە وەڵامدا بڵێ ئەگەر جگەرەکێشان کارێکی خراپ بووایە باوکم نەیدەکێشا! خۆئەگەر باوکی خاوەنی سەدان ئاکاری جوان بێت، پێی بڵێی ئەی بۆچی تۆش وەکو باوکت ئەو کارە چاکانە ئەنجام نادەیت، لە وەڵامدا دەڵێت: من ناتوانم وەکو باوکم ئەو کارانە ئەنجام بدەم، بە داخەوە زۆرێك لە منداڵان تەنها لە شتە خراپەکاندا چاو لە باوانیان دەکەن»!

بەڵام کوڕی دووەم، کاتێك دەڵێت: چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت، مەبەستی ئەوەیە کە نابێت من بە هەمان ڕێبازو ڕێچکەی باوکمدا بڕۆمو هەمان هەڵەو مێژووی باوکم دووبارە بکەمەوە، بە پێچەوانەوە من پەندم لە ژیانی باوکم وەرگرت، لە دوای بەند کردنی باوکم بە هەر دەردە سەرییەك بێت خوێندنم تەواو کردو دواتر لەم کۆمپانیایە بوومە کارمەندو پاشان بە هۆی دڵسۆزییو لێهاتوویم لە کارەکەمدا پلەی بەڕێوەبەرم پێبەخشرا!

مرۆڤی ژیر هیچ کات بە ڕێگایەکدا ناڕوات کە لە پێش ئەوەوە کەسانێکی دووچاری ڕۆژگارێکی تاریكو ناهەموار کردووە، بەڵکو لەوانە پەند وەردەگرێتو هەڵەی کەسانی دی دووبارە ناکاتەوە ئەگەرچی نزیکترین کەسیشی بێت!

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە مەرج نییە ئەو کەسەی خۆی خراپەکارەو ڕێگەی هەڵەی گرتووەتە بەر، نەوەکانیشی هەمان هەڵەو سیناریۆ دووبارە بکەنەوەو لە نێو کۆمەڵگەدا بە چاوێکی کەم سەیریان بکرێت، بەڵکو دەگونجێت نەوەکانی ئەو کەسە وەکو کوڕی دووەمی ئەم پیاوە دوور بکەونەوە لە ڕێبازی خراپو مێژووی باوانیان دووبارە نەکەنەوە، لە هەمان کاتدا کەسانی زیرەكو بە ئەزموونو لێهاتوویان لێ دەربچێت، کە بتوانن خزمەتی خۆیانو وڵاتو شارەکەیان بکەن.

بەو هیوایەی هەموومان چاو لە شتە باشەکان بکەینو لە خراپەکان دوور بکەوینەوە!

# درۆ... سپییەکەشی هەر ڕەشە

سەروەر حسێن

ئایینو زانستو هزرێك نییە دژی نەبێتو زۆربەی زۆری مرۆڤەکانیش بەردەوام بە جۆرێك لە جۆرەکان گرفتارین، کەس خێری بەردەوامی لێنەبینیوەو هەر بە بەرچاومانەوە، یان لە مێژوو و نێو کتێبەکاندا دەبینین دەیان کەسی کردووە بە پەند، هێشتا کۆمەڵێك عەشقبازی لەگەڵ دەکەن... لە ڕاستیدا لە کاتی پێویستبوونیشیدا (بە وتەی هەندێك) هەر قێزەونو تاوانە، کەچی هەندێك کەس هێندە هۆگری بوون بەم دەستو بەو دەست خەریکی درۆکردنن، ئەوە پەتاو نەخۆشییە ترسناکەکەیە (درۆکردن).

هاوڕێییەکم هێندە بێزاربوو بوو دەیگوت: هەمووان درۆدەکەن، بەرپرس بۆ میللەت، ئەو کەسانە کە هاوڕێو دڵسۆزو خەمخۆری یەکتر دەردەکەون، دایكو باوك بۆ منداڵەکان، مامۆستاو قوتابی بۆ یەکتر، ئەو وتەنی: تەنانەت درۆ لەگەڵ خوداو خودو عەشقیش دەکرێت، بەڵام کە مرۆڤەکان هەست بەو هەموو درۆیە ناکەنو لە تاوا نادەن بە کێوداو تەنهایی نێو بیابانێکی بێ ئاوو نان هەڵنابژێرن، مەسەلە ئەوەیە کە ئەمانیش بوونەتە بەشێك لە جەستە گەورەکەی «درۆ ئەفەندی!»

ئاخر درۆکردن تەنها هەڵاوگێڕو گۆڕینو جێگۆڕکێی وشەکان نییە، درۆ بە جەستەو جوڵەی برۆو چاوەکان دەکرێت، بە دەرخستنی ددانەکانو سەرلەقاندن، تەنانەت هەندێجار بێدەنگیش درۆکردنە.

زۆرجار خەڵك لە گێڕانەوەی وشەکاندا ڕاستگۆن، بەڵام لە ئاوازی وتنی وشەکاندا درۆدەکەن!

درۆکردن لە ناخەوە مرۆڤ وێران دەکاتو بێمتمانەیی دروستدەکات، لە کۆمەڵگادا تاکەکان لە یەکتر دڕدۆنگو گومانی ناباش لە نێوانیاندا بەرپا دەکاتو جوانییەکانی بەرامبەر دەشارێتەوەو ئیرەیی بردنو چاڵ بۆ یەکتر هەڵکەندنو هەمیشە سەنگەر لە یەکتر گرتن بڵاودەکاتەوە، ئەوە نییە مرۆڤ جاری وا هەیە گومان لە هەموو کەسو دیاردەکان دەکات، تەنانەت خەندەو نیگا جوانەکانیش بە ساختە دەزانێت؟! ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش درۆکردنی لە سەرەوەی هەموو تاوانەکانەوە داناوە، واتە بە تاوانتر لە هەموو تاوانێك دایدەنێت.

گەلێك کەس جۆر بۆ درۆ دروستدەکەنو پۆلینی دەکەن، بەڵام پێموایە ئەوە دروست نەبێت، چونکە دەکرێت لە کاتێکی دیاریکراودا ڕاستییەك نەگوترێتو هەڵبگیرێت بۆ کاتو ساتێکی تر، یان شێوازی دەربڕینی ڕاستییەکە دەستکاری بکرێت، وەلێ بە هیچ شێوەیەكو بۆ هیچ مەبەستێك پێچەوانە گوتنی ڕاستی کارێکی دروست نییەو پێچەوانەی هەموو بەهاو بنەمایەکی ڕەوشتیو ئاینیو مرۆییە.

تۆ بڕوانە لە سیمای کەسێك چی بەسەردێت کاتێك درۆکەی ئاشکرا دەبێت؟ وشەکەی چەند ناشیرینو بێزراوە؟! خاوەنی ئەو نازناوە چەند تەنیایە؟! خەڵك چۆن لە دەستی هەڵدێن؟! باش دەزانێت ڕۆڵ بگێڕێتو زمانی بۆ وتنی ناڕاستی بەکاربێنێت، بەڵام بەدبەختی ئەو کەسانە لەوەدایە ڕاستییە ڕەهاکانیش لە دەمی ئەمانەوە ئەرزشی نامێنێتو کەس وەك ڕاستەقینە وەریانناگرێت.

بەرامبەر بە درۆگوتن ڕاستبێژی هەیە، دەرەنجامەکانی بە تەواوی جیاوازنو گەورەییو متمانەو ڕێزو خۆشەویستیو دڵنیابوون لە ناخو نێوان کەسەکاندا پەیدا دەکات.

پێم وایە هەموومان هەموو شتێك لەسەر ڕاستیو ناڕاستی دەزانین... ئەو هەموو جوانیو قەشەنگییەی ڕووخساری پڕ بەرائەتی منداڵ لە هەڵوێستە جیاوازەکاندا دەبینینو تێناگەین منداڵ بۆ هێندە جوانە! بۆچی خودای گەورە ئەوەندە نازدارو پاك دروستیکردووە؟! هەموو مەسەلەکەش لەوەدایە کە ڕقو درۆکردن نازانێت، نواندنی ساختە ناکات، درۆی (سپیو ڕەشو بەرژەوەندی!) شتی وا نەچووەتە نێو فەرهەنگییەوە، درۆزنە لێزانو کارامەکانیش لە منداڵیاندا هەر وابوون، بەڵام گەورەکان هێند ناڕاستیان وتووەو نواندووە، ئیتر وردە وردە جوانییە سروشتییەکە کاڵ بووەتەوە... کەواتە گرنگە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ سروشتە پاکەکەی خۆی، ئەو دەمە ڕاستگۆییو ئاکارە جوانەکان دەبنە سیمای هەمیشەیی ئەو.

محەممەد حەسەن عەبدوڵڵا

# زمانی گوڵ بەکاربهێنە

زمانێکی شیرینو جوان، پاراو و ڕوون، سادەو ئاسان، کەست لێ زوویر نابێت، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەدیهێنەرمان، چونکە خۆی داوای لێکردووین کە کەس لە خۆمان زوویر نەکەین.

چەندجار ڕێککەوتووە لەگەڵ بەرامبەردا بە زمانێکی دڕکاوی، یان بە زمانێکی توڕەییەوە، قسەمان کردووە؟ ئەی چەندجار ڕێککەوتووە کە بە زمانی گوڵو شیرینانە قسەمان لەگەڵ بەرامبەرماندا کردووە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە دەروونی خۆماندا دەدەینەوە، تاوەکو هەر خۆمان بزانینو ئاشکرا نەبێت، چونکە ڕەنگە چاوەڕواننەکراو بێت بە باش، یان بە خراپ.

کە پێکەوە دادەنیشین لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێ، هاوکار، یان هەر کەسێکی تردا، باسی کەسایەتی بەرز دەکەین، یاخود باسی کەسێکی دیاریکراو دەکەین کە کەسایەتییەکی بەرزی هەیە، ئێستا وەرن با پێکەوە، یان هەر یەکێك لای خۆمانەوە وێنەی ئەو جۆرە کەسایەتییە بکێشینو بیخەینە بەرچاوی خۆمان، تاوەکو باسەکە ڕوون بێت لامان، لە وەسفی ئەو کەسایەتییەدا دەڵێین: کەسێکی زمان شیرینو قسە خۆشە، ڕۆشنبیرە، دیندارە، زیرەکە.... هتد.

سەرنج بدەن زۆربەی جار لە یەکەم ساتی بە یەك گەیشتنمان لەگەڵ کەسێکدا سەرنجی زمانی قسەکردنی دەدەینو لێی ورد دەبینەوە، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ کەسەکەدا زوو زووش یەکتر ببینینو قسە بکەین، گرنگ ئەوەیە لە هەر یەکتر بینینێکدا یەکەم سەرنجمان بۆ زمانی قسە کردنییەتی، چونکە زمان زانیاری وتەبێژی فەرمی کەسەکانەو زۆربەی شتەکان بە زمان دەردەبڕێن بۆ بەرامبەرەکان، چ زمانی قسەکردن بێت، یان زمانی نوسین، کەواتە زمانی قسەکردن ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە کاروبارەکانماندا و بەرامبەر سەرنجی وردی دەدات بۆ هەڵسەنگاندنمان.

نموونەیەکی واقیعی ژیانی هەموومان، چەندجار ڕێککەوتووە کە لە کەسێك زوویر بووین، یان بۆچوونی کەسێکمان ڕەت کردۆتەوە، یان باش باسی کەسێکمان نەکردووە، تەنها لەبەرئەوەی کە زمانی گفتوگۆو قسەکردنی لەگەڵماندا جوان نەبووە، یان نەیتوانیوە بە زمانێکی شیرینو سادە تێمانگەیەنێت؟

هەر کەسێکی سەرکردەو پێشەنگ لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە، یان هەر کەسێك کە مێژووی مرۆڤایەتی بە باشی باسی کردبێتو گۆڕانکاریی گەورە لەسەر دەستیدا ڕوویدابێت، جیهان بە هۆیەوە پێشکەوتبێت، بێگومان بن لەوەی کە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی، بریتی بووە لە زمانی، هەڵبەت لێرەدا تەنها مەبەستمان زمانی قسەکردن نییەو بەس، بەڵکو مەبەستمان زمانی نووسینیشە.

کەواتە هەموومان پێویستمان بە زمانێکی پاراو هەیە بۆ تێگەیاندنی بەرامبەرەکانمان، ئەمەش سەرچاوەکەی لای هەموو مرۆڤێك هەیەو لە کەس نەشاردراوەتەوە، تەنها بەکارهێنانی دەوێت، ئەویش بڕیارێکی بوێرانەو ئیرادەیەکی بەهێزی دەوێت کە ئیتر لەمەودوا بە زمانی گوڵ لەگەڵ هەمووواندا قسە بکەین، ئەگەر چی بەرامبەرەکانیشمان بە زمانێکی تەنانەت دڕکاویش قسەمان لەگەڵدا بکەن، چونکە زمانی ئێمە شیرینەو دەربڕینی خۆشەویستییەو لەناوبەری شەڕو تێکدانە، بۆیە دواجار هەر زمان شیرینەکان سەردەکەونو پەشیمانی بێ سود دەرنابڕن.

# خودایە داوات لێدەکەم

و: بەهەشت محەممەد

خودایە: ئومێدم پێ ببەخشەو ڕەشبینیم تێدا مەهێڵە.

خودایە: تۆوی خۆشەویستی لە دڵمدا بچێنەو ڕەگو ڕیشەی ڕقو کینە لە ناخمدا هەڵبکێشە.

خودایە: بەهێزم بکە، تا بتوانم بەسەر ڕەوشتە خراپەکانمدا زاڵ بم، ژیریم پێ ببەخشە تا بەسەر لە خۆباییبوونمدا سەر بکەوم.

خودایە: بیناییم بەهێز بکە بۆئەوەی کەموکورییەکانی خۆم بە ڕوونی ببینم، پەردەیەکی ڕەش بەسەر چاوانمدا بهێنە تا لە سەیرکردنی کەموکوڕی کەسانی تردا زیادە ڕەوی نەکەم.

خودایە: یارمەتیم بدە تا بتوانم زۆرترین ژمارە لە خەڵکی دڵخۆش بکەمو ڕۆژە خۆشەکانیان زیاد بکەم، شەوە گریاناوییەکانیان کورت بکەمەوە.

خودایە: چێژی لێبووردەییم پێ ببەخشە، ئارەزووی تۆڵە کردنەوەم لێ دابڕنە...

خودایە: وام لێ بکە لە بەرامبەر بە دەسەڵاتەکاندا بێ هێز نەبم، لە بەرامبەر بێ تواناکانیشدا دڵڕەقو توندوتیژ نەبم.

خودایە: لە ناخمدا بەزەییو لێخۆشبوون بڕوێنە، توڕەییو دڵڕەقیم لێ وەربگرەوە.

خودایە: دڵم پڕ بکە لە باوەڕبوون بە خۆت، هەموو ژیانیشم لێوان لێو بکە لە خۆشەویستیت.

خودایە: ئەگەر لە خۆباییبوون کوێری کردم، بیناییم پێ ببەخشە، ئەگەر ڕۆژگارێك بەهێزت کردم، یادم بخەرەوە کە هێز بەردەوام نابێت، ئەوە ڕاستییە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە..

خودایە: هەر کات کەوتم فێرم بکە چۆن دووبارە هەستمەوە، کاتێکیش هەستامەوە بیرم بخەرەوە کە کەسانێك کەوتوون تا یارمەتیان بدەم ئەوانیش هەستنەوە.

خودایە: ئەگەر بەسەر دووژمنەکانمدا سەرت خستم، لێنەگەڕێی هیچ کات تانەو تەشەریان لێ بدەم.

خودایە: وام لێ بکە تێکەڵی نەکەم لە نێوان قەناعەتو زەلیلیدا، لە نێوان بە ڕێزیو لە خۆباییبووندا، لە نێوان خاکی بوونو خۆ بەکەمزانیندا.

خودایە: بمکەیت بە یەکێك لەو مۆمانەی بە تیشکی ڕووناکییان ڕێگە تاریکەکان ڕووناك دەکەنەوە.

خودایە: کۆمەکم بکە تا لێبوردن لە ناو خەڵکیدا بڵاو بکەمەوەو پێیان بڵێم تۆڵەسەندن چەکی بێ تواناکانە، لێ بووردنیش چەکی بەهێزو دڵ گەورەکانە.

خودایە: یارمەتیم بدە تا کەموکوڕییەکانی خۆم بە گەورە تەماشا بکەم، کەموکوڕی کەسانی دەوروبەرم لە بیر بکەم، تا لە بیرمدا جێ خۆش نەکەن.

خودایە: ئەگەر هەڵەم بەرامبەر کەسانێك کرد یارمەتیم بدە، داوای لێبوردنیان لێ بکەم، ئەگەر کەسانی تر هەڵەیان بەرامبەر کردم یارمەتیم بدە بتوانم لێیان خۆش بم بێ ئەوەی چاوەڕێی داوای لێبوردنیان لێ بکەم.

خودایە: وام لێ بکە زێتر چێژ لە بەخشین وەربگرم، نەك لەوەرگرتنەوەی قەرزی قەرزدارەکان.

خودایە: داوات لێ دەکەم هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرمن، دڵخۆشیان بکە ئەو کاتە من هەست بە خۆشییەکانم دەکەم، من ناتوانم لە نێوان فرمێسکەکاندا پێ بکەنم، بە هەڵهاتنی تیشکی خۆر چۆن دڵخۆش بم، لە کاتێکدا دەوروبەرم لە تاریکیدا بژین.

خودایە: ئەگەر خەڵکی خشتیان تێگرتم کۆمەکم بکە، ئەو خشتانە کۆبکەمەوەو بینای ئارام گرتنی لێ دروست بکەم، ئەگەر گوڵیان تێگرتم یارمەتیم بدە ئەو گوڵانە بدەمەوە لە یەخەی ئەو کەسانەی فێریان کردمو دەستە بچکۆلانەکانیان گرتم بۆ سەرکەوتنم لە ژیاندا.

خودایە: یارمەتیم بدە، ستەم لێکراوان پشتگوێ نەخەم، لە ستەمکارانیش نەترسم.

خودایە: یارمەتیم بدە تا قەناعەت بە خەڵکی بکەم کە دەستکەوتنی ماڵی حەڵاڵ، چەندە کەم بێت، باشترە بۆیان لە ماڵێکی زۆری حەرام.

خودایە: هیچ کات ڕێگە نەدەیت نائومێدی بێتە نێو دڵمەوە، بەڕاستی نائومێدی چاوەکان کوێر دەکاتو دەرگا کراوەکان نابینێت.

خودایە: یارمەتیم بدە ئەوپەڕی ڕێز بگرم لەو کەسانەی لە گەشتی ژیاندا یارمەتیم دەدەن، فێرم بکە چۆن فرمێسکی خەڵکی بسڕم، لەسەر لێوەکان وێنەی زەردەخەنەو پێکەنین بکێشم.

سەرچاوە/ کتێبی (سهرة عائلية).

# ئاسوودەبوونی ڕۆح

شێخانی

لە سەر شۆستەکە لە پەنای دارتوویەکدا کە پاییز هەموو گەڵاکانی دارنیبوو، لە ئێوارەیەکی درەنگدا چاوەڕوانی پاسی دەکرد، باران هێواش هێواش دایکردبوو، خەریکبوو دنیا تەواو تاریك دەبوو، بەوە دەچوو ئیتر کاتی هاتنی پاس نەمابێت، هێشتا هەر چاوەڕوان بوو چاوی لە ڕێ بوو، چونکە پارەی تاکسی پێ نەبوو..

بارانەکە توندی کردو بە خوڕ دەهاتە خوارێ، کزەی بایەکی ساردیش دەهات، «تەواو خۆی گرمۆڵە کردبوو، پیرەمێردێکی بچکۆلانە» پشتی بەسەر گۆچانەکەیدا چەمابووەوە، جارجار کاتێك دەکەوتە بەر ڕۆشنایی گڵۆپی ئۆتۆمبیلەکان تارماییەکەی دەردەکەوت.

بارانەکە تەواو تەڕی کردبوو، هەموو جلەکانی خووسابوون، تا دەهات کات درەنگتر دەبوو، نەیدەزانی چی بکات، خەیاڵی لای هاوسەرەکەی بوو، ئێستا چاوەڕوانی دەکات و نیگەرانێتی.

لە ناکاو ئۆتۆمبێلێکی قەشەنگ ڕاوەستا. سەرەتا وایزانی تاکسییە. بۆیە زۆر ڕووی نەدایە، دواتر کە گوێی لە دەنگی شۆفێرەکەی بوو، دەیگوت: مامە حاجی سەرکەوە، هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵمژی و بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکە هەنگاوی نا..

هەموو گیانی وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی، دڵۆپی بارانەکە بەسەر ڕیشە سپییەکەیدا دەهاتنە خوارێ، بە ئەسپایی سەرکەوت، ناو ئۆتۆمبێلەکە گەرم بوو، دوای سڵاوکردن بەردەوام دوعای خێری بۆ دەکرد، لە پەروەردگار دەپاڕایەوە کە لە هەموو بەڵایەك بیپارێزێت، دەیگوت: کوڕم زۆرم سەرما بوو، دەمێکە چاوەڕوانم ئێستا پیرێژنەکەم دڵی لەلامە.

پیرەمێردەکەی گەیاندە ماڵی خۆیان، لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزیو دەستی گرتو لە دەرگای ماڵەکەیانی دا، پیرێژنێکی نورانی بە هەڵەداوان دەرگاکەی کردەوە.

-حاجی گیان لە کوێ بوویت؟! دواتر کە ئەمی بینی گوتی: بەخێربێی کوڕم دەوەرە ژوورێ.

- سوپاس دایە گیان، ماڵتان ئاوابێت.

لە گەڕانەوەیدا هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد، لەو ڕۆژەوە کە ئەو ئۆتۆمبێلەی کڕیوە ئەوەندە هەستی بە شادمانی نەکردبوو، ئۆتۆمبێلەکەی بە شتێکی پیرۆز دەهاتە بەرچاو، لە خۆشیاندا خەریکبوو باڵی دەگرت.

ئەو شەوە زانی یارمەتیدانی خەڵکیو درێژکردنی دەستی یارمەتی چ ئاسوودەییەك بە ڕۆحی مرۆڤ دەبەخشێت، بۆی دەرکەوت کە ژیان بێ یارمەتیدانو هاوکاریو مرۆڤدۆستیو خۆشەویستی هیچ مانایەکی نییە!!